ئەو پرسیارانەی تامەزرۆی زانینی وەڵامەکانیانم

# تامەزرۆی ناسینی بەهەشتم

پاش ئەوەی لەم جیهانە دەمردین، چیمان لێ بەسەردێت؟ جیهانی بەرزەخ چۆنە؟ چۆن قیامەت بەرپادەبێت؟ چۆن زیندوودەکرێینەوە؟ [illegible] چۆنە؟ لە گۆڕەپانی لێپرسینەوە (مەحشەر)دا چی ڕوودەدات؟ چاکە[illegible] چۆن کێشانە دەکرێن؟ ئایا لە قیامەتدا پێغەمبەری ئازیزمان لەگەڵ دەبێت؟ چۆن بە پردی (صیراط)دا تێدەپەڕین؟ بەهەشت شوێنێکی چۆنە؟

با پرسیارەکانتان بێ وەڵام نەمێننەوە!



ئۆزکان ئۆزە

و: ئاوات عبدالله بابان

پەرتووكی پێنجەم لە زنجیرەی

(ئەو پرسیارانەی تامەزرۆی زانینی وەڵامەكانیانم)

# تامەزرۆی ناسینی

# بەهەشتم






ناوی کتێب: تامەزرۆی ناسینی بەهەشتم

نووسەر: ئۆزکان ئۆزە

وەرگێڕ: ئاوات عبداللە بابان

پێداچوونەوە: بەهرە محمد علی

نۆرەی چاپ: یەکەم - ٢٠١٤

# ئەو پرسیارانەی تامەزرۆی زانینی وەڵامەکانیانم

# سەرەتا

سڵاو!

لــە پــەرتووکی ژمــارە (٥)ی ئــەم زنجیرەیــەدا پێکــەوە بــاس و خواسێك دەکەین دەربارەی مردن و ڕۆژی دوایی...

لەبەرئەوەی هەموومان دەمرین، بۆیە دەبێت مردن و ژیـانی دوای مردن لە ڕیـزی پێشـەوەی ئـەو شـتانەوە بـن کـە ئـارەزووی زانینیـان دەکەین، ئەی وانیـە؟ بـە بۆچـوونی مـن نامۆیـە گـەر مـرۆڤ هـیچ کـات مردنی وەبیرنەیەتەوە و بیر لە ژیانی دوارۆژ نەکاتەوە.

بەڵێ، ئەمە نامۆیە هێندەی ئەو کەسـەی سـواری شـەمەندەفەرێك بووە و ناشزانێت شەمەندەفەرەکە بەرەو کوێ دەڕوات...

ئەم زەویە دەڕوات و ئێمەش لەگەڵ خۆیدا دەبات. بەڵام بـۆ کـوێ دەچـین؟ لـەو جێگایـەی بـۆی دەچـین چ شـتێکمان تـووش دەبێـت؟ هەموو ئەمانە پرسیارگەلێکن، وەڵامدانەوەیان لەلایەن ئێمەوە کارێکی پێویستە.

کـە پرسـیت: "ئایـا مـردن چیە؟"، مـن ٢٥ سـاڵ پـێش ئێسـتام هاتەوە یاد کاتێك لەسەر پـەلی دار هـەنجیرێك تەماشـای ڕەوتـی پەڵـە

هەورەکانم دەکرد و هەمان پرسیارم لە خۆم دەکرد. ئـەوکات کەسێك لە چواردەورمدا نەبوو وەڵامی بۆ من پێ بێت. منـیش ئـەمڕۆ هەوڵمـدا ئەو وەڵامەی ئەو سەردەمە تامەزرۆی زانینی بووم، بدەمـەوە بـە تـۆ. هاااا، ئەوەشت لەیاد نەچـێت هـەر کـە ئـەم پەرتووکـەت خوێنـدەوە و خۆت بە خۆتت وت: "ئەمە رێك ئەوەیە من دەمویسـت بیـزانم"، بزانـە منیش دەڵێم: "ئەمە رێك ئەوەیە من کاتی خۆی دەمویست بیزانم".

چونکە لەم زنجیرە کتێبـەدا چـیت پرسـیبێت، منـیش بـە منـداڵی پرسیومە.

دەمەوێت بڵێم: پێدەچێت پـەرتووکی حەوتـەم نـاوی "تامـەزرۆی ناسـینی فریشـتەکانم"بێت، لـە دووتـوێی ئـەودا تـاوتوێی فریشـتە و ڕۆحانیەکانی دیکەی ژیانی دوارۆژ دەکەین...

لەوانەش: ئایا ڕۆح چیە، جنۆکـە و فریشـتە چۆن بوونـەوەرێکن، ئایا بانگکردنی ڕۆحیانەت هەیە یان نا؟...

تۆش پاش خوێندنەوەی ئەم پەرتووکەی بەردەسـتت هـەوڵ بـدە پرسـیـارەکانت لـــەو بارەیـــەوە ئامـــادە بکـــەیت! بـــەهیوای بەیەکگەیشتنەوە لەو کتێبەدا...

# تامەزرۆی ناسینی

# بەهەشتم



﴿إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ الْمَلَائِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَبْشِرُوا بِالْجَنَّةِ الَّتِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ، نَحْنُ أَوْلِيَاؤُكُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الْآخِرَةِ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِي أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ، نُزُلًا مِّنْ غَفُورٍ رَّحِيمٍ﴾ فصلت:٣٠– ٣٢.

واتە: (بەڕاستی ئەو کەسانەی وتوویانە: پەروەردگاری ئێمە زاتی خوایە و، پاش ئەو دان پیانانەیان لەسەر باوەڕ بەو قسەیان و فەرمانبەرداری کردنی خوا بەردەوام بوون، ئەوانە فریشتە دێنە خوارەوە بۆ سەریان و پێیان ئەڵێن: لە هیچ مەترسن و خەفەتی هیچ مەخۆن و خۆش مژدە بن بەو بەهەشتەی لەسەر زمانی پێغەمبەران گفتتان پێ ئەدرا کە بۆتان ئەبێ. هەروا پێیان ئەڵێن: ئێمە لە ژیانی دنیاو لە قیامەتا دۆستی ئێوەین و، بۆتان هەیە لە قیامەتا ئەوەی نەفستان حەزی لێ بکاو هەرچییش داوای بکەن. ئەمەیشتان لەلایەن خوایەکی پەروەردگاری بەخشندەی میهرەبانەوە بۆ ئامادە ئەکرێ).



# ئایا مردن چیە؟





من سەرەتا لەژێر گوڵە "پەنجەخانم"ێکدا بە مردن ئاشنابووم. تەمەنم شەش ساڵ بوو. وەرزی هاوین و ئاو و هەوا گەرم بوو.

لەنێو پەل و پۆی گوڵە بۆنخۆشەکەدا چەند مێش هەنگێك چڵاوچڵیان دەکرد. منیش لەولاوە لە سێبەری درەختێکدا پاڵم لێدابووەوە...

مردن لەنێو سندوقێکی تەختەدا بوو، لە کۆڵانە تەسکەکەی بەرەو گۆڕستاندا و بە یاوەری ئاپۆڕای خەڵك و دەنگی نزاکردنەوە لە سەرشان نرابوو..

لەودیوی پەل و پۆی "پەنجەخانم"ەکەوە تەماشای قەرەباڵغیەکە و تابووتەکەم دەکرد و واقم وڕمابوو بەدیاریەوە.

تەمەنم شەش ساڵ بوو، ئەمە یەکەم ڕووبەڕووبوونەوەم بوو لەگەڵ دەستەواژەی مەرگدا...

ژنان هێندە بەکوڵ دەگریان کە پێشتر گریانی لەو شێوەیەم نەدیبوو، هەروەها یەکەمجار بوو ببینم پیاوی گەورە گەورە دەگرین و فرمێسک بەچاویاندا دێتە خوارەوە.

ناوبەناو هاوارێکی توند دەکرا بەجۆرێك هەم دەنگی گریانی ئەوانی دیکەی دەشاردەوە هەم منیشی دەترساند.

پاشان: مامۆستا بەدەنگێکی نەرم و نیان دەستی کرد بە قورئان خوێندن.

پیاوێکیش بە هەرچی هێزێتی و لەناخەوە وتی: "لا إله إلا الله".

یەکێکی دیکە خەمبارانە ئامێکی هەڵکێشا: "ئای مردن چەند ڕووداوێکی گەورەیە!".

ناخم پڕبوو لە هەنسك، هێندەی نەمابوو فرمێسك بەچاومدا بێتە خوارەوە و (مەتین)م بینی.

مەتین باشترین هاوڕێم بوو، کەسێکی زۆر ژیر بوو. جیاواز لە هەمووان ئەوەی ئێمە نەماندەزانی ئەو دەیزانی، ئەوەی ژیریی ئێمە پەی پێ نەدەبرد ئەو لەبارەیەوە دەدوا. تەمەنی لە تەمەنی من گەورەتر بوو و هەمیشە پرسیارم لێدەکرد. ڕاست یان هەڵە، مەتین هەردەم وەڵامێکی پێبوو.

"ئایا ئەو سندوقە چی تێدایە؟".

"ئەوە سندوق نییە".



"ئەی چیە؟".

"تابووتە".

"تابووت چیە؟".

"ئێ کابرا مردووە..".

"ئیدی چی؟".

"ئەوانیش خستیانە ناو تابووتەکەوە و بردیان".

"بۆ کوێ؟".

"گۆڕستان، قابیلە بۆ کوێی بەرن!".

"لە گۆڕستان چی هەیە؟".

"گۆڕی لێیە".

"ئەی گۆڕ چییە؟".

"مردوو لە گۆڕدا دەخرێتە ژێر خاکەوە".

"دەیانخەنە ژێر خاکەوە؟".

"بەڵێ وایە! ئێمە جەژنان دەچین بۆ گۆڕستان، دایکم لەوێ قورئان دەخوێنێتەوە...".

"ئایا چۆن دەکرێت مرۆڤ ژێر خاک بخرێت؟".

"کاتێك بەرەحمەتی خوداچوو، ژێرخاك دەخرێت".

"بەرەحمەتی خودا چوو ئیدی یانی چی؟".

"یانی نازانی؟".

"نەخێر".

"کاتێك کەسێك دەمرێت یانی بە رەحمەتی خوا چووە".

"من مردنم ناوێت!".

"کورە، هەموو کەسێك هەر دەمرێت".

"هەموو کەسێك؟".

"بەڵێ هەموو کەسێك".

"بەلام بۆچی؟".

"ئیتر وایە".

"مردووەکان لەناو گۆڕدا چیان بەسەر دێت؟".

"ئەگەر کەسێکی باش بێت، لە گۆڕەوە دەچێت بۆ بەهەشت".

"بەو جۆرە دەچین بۆ بەهەشت؟".

"ئەی پێشبینی چیت دەکرد! خۆ ناکرێت بەبێ مردن بچینە بەهەشتەوە".

"کەوابێت گۆڕ شوێنێکی باشە".

"بێگومان بۆ ئەوانەی دەچنە بەهەشتەوە شوێنێکی باشە".

هەردووکمان بێدەنگ بووین. تاکو لەوسەری کۆڵانەکەوە دەرچوون، وەك بڵێیت هەر بەوێشدا تێنەپەڕیوون، سەیری قەرەباڵغیەکەمان کرد تاکو لەچاو ونبوون. بێدەنگییەك باڵی بەسەر کۆڵانەکەدا کێشا. بۆ ماوەیەك تەنیا دەنگی سیسرکی سەر پەلی دارهەڵۆژەکە دەهات. لەپڕ مەتین کردی بە قۆڵمدا و وتی:

"ئەها هەفتەی پێشوو باران باری".

"ئێ چی بوو؟".

"لە تەنیشت یاریگاکەوە باراناو کۆبووەوە".

"ئێ؟".

"یەك دونیا سەرەمێکوتەی تێدایە".

"سەرەمێکوتە چیە؟".

"کوڕە، بێچوە بۆق! سەرەمێکوتە ئەوەیە کە گەورەبوو دەبێتە بۆق".



"هممم".

"یانی نازانیت؟".

"نا، لەکوێ بزانم".

"وەرە بڕۆین سەیری بکەین".

"بابڕۆین!".

ئەو ڕۆژەمان تا ئێوارە بە پڕکردنی قوتوی شکاو بەئاوی قوڕاوی و سەرەمێکوتەوە بەسەربرد. خۆشمان ڕابوارد و پێکەنین، ناوبەناو لەسەر یاریەکان دەبووە دەمەقاڵێمان و لەیەکتر توورە دەبووین.

دوای پەپوولەیەك کەوتین، دنەی هاڕەیەکمان[1] دا کە خۆی لە پەلی دارتوویەکەوە ئاڵاندبوو، تاکو ئەوکاتەی لە ترسی زەردەواڵەیەك هەڵهاتین.

کاتێك ڕامانکرد، چەند سەرەمێکوتەیەك لە قوتوە شکاوەکەوە بەربوونەوە سەر زەوی. ئێمەش بۆ ئەوەی نەمرن، خێرا بەدەست کۆمان کردنەوە و خستمانننە نێو گۆماوەکەوە.

بەڵام ئەوکاتە نە باسی مردنمان کرد، نە سندوقە تەختەکە کە بە قوماشێکی سەوز باندرابوو.

هەرچەندە من یەك دووجار پرسیم: "ئایا مرۆڤ پێش ئەوەی بچێتە بەهەشتەوە زۆر لە گۆڕدا دەمێنێتەوە؟"، بەڵام مەتین سووربوو



[1] – هاڕە: جۆرە مێرووەیەکی تووکنە و شێوەی لە کرم دەچێت.

لەسەر ئەوەی چیرۆکێکم بۆ بگێڕێتەوە کە بۆ ئەو تەمەنەی من تێگەیشتنی زۆر ئەستەم بوو، ئەویش چیرۆکی هاتنەدەرەوەی پەپوولە بوو لە قۆزاخەکەی.

ئەو هەرگیز جارێکی دیکە بابەتی مردنی باس نەدەکرد. ئەمە لەکاتێکدایە نە ئەوکاتەو نە ئەمڕۆش من هێندەی ئەو دەربارەی مردن نازانم، چونکە ئەو باوکی مردبوو..

وەلێ من هیچ زانیارییەکی ئەوتۆم نەبوو... شەوان لەژێر سایەقەی سامالْ و ترووسکەی ئەستێرەکاندا خەو لەچاوم دەزڕا. کە هەڵدەسام لەژێر ڕۆشنایی گڵۆپەکەی بەردەرگا و جیلوەی ئەستێرە گەشەکانی ئاسماندا چاوم دەبڕیە ئاهەنگی پەپوولەکان.

چەند پرسیارێك لە مێشکمدا دروست بووبوو وەك: مردن چۆن حاڵەتێکە؟ ئایا کەی خۆشەویستانمان دەمرن؟ کاتێك چوونە گۆڕەوە پاشان چۆن دەچنە بەهەشتەوە؟

یەکەم ڕووبەڕووبوونەوەم لەگەڵ "مردن"دا لە تەمەنی شەش ساڵیدا بوو، وەلێ ئێستا تەمەنم سی و شەش ساڵە.

بێشك لەماوەی ئەم چەند ساڵەدا وەڵامی گەلێك پرسیارم دەستکەوتووە، بەڵام هێشتا چەندین شت هەیە نایانزانم.

بۆ نموونە: هێشتا نازانم مردن چۆن حاڵەتێکە...

## ئەرێ بەڕاست مردن چیە؟

خۆ ئەگەر بڕوانینە بنەمای ئەم پرسیارە، لەوانەیە بە خۆمان بڵێین: ئەگەرچی ماوەیەکی دووروودرێژی دیکەش وەڵامەکەی نەزانم شتێکی ئەوتۆ ڕوونادات. هەرچۆن بێت، دواجار هەر بۆم ڕوون دەبێتەوە...

بەڵێ ڕۆژێك بۆم ڕوون دەبێتەوە!

ئیدی ئەوکات بەخۆم دەڵێم: "بەڵێ، کەوایە مردن بەم شێوەیەیە!".

بەڵام ئەوکات ئیدی بوار نابێت ئەوەی خۆم فێریووم بۆ تۆشی باس بکەم. چونکە ئەوسا ئیدی من لێرە نابم... تێدەگەیت مەبەستم چیە؟

ئاسانترین ڕێگا بۆ تێگەیشتن لە مردن لەڕێگەی بیرکردنەوە دەبێت لەوکاتەی هاتینە دونیاوە.

دەزانم پێت سەیرە!

لەکاتێکدا مردن و لەدایك بوون هێندە لەیەکەوە دوورن، ئیتر چۆن دەکرێت ڕێگای تێگەیشتن لە مردن بە لەدایکبووندا تێپەڕێت؟

بەڵام ڕاستیەکەی بەو شێوەیەیە!

گەلێك لێکچوون هەیە لەنێوان لەدایکبوون و مردندا، لەنێوان هاتنە دونیا و لە دونیا دەرچووندا...

## لەدایکبوون و مردن

ئەگەر دەرفەت هەبوایە و بە کۆرپەی ناو سکی دایکێکمان بوتایە: "ڕۆژێـك دێـت لێـرە دەچـیتە دەرەوە"، ئـەم هەواڵـە کۆرپەکـەی دەترساند...

– چی لێرە دەڕۆمە دەرەوە؟

– بەڵێ لەدایك دەبیت.

– وتت لەدایکبوون؟

– بەڵێ وتم لەدایکبوون. تۆش وەك هەر کۆرپەیەکی دیکـە ڕۆژێـك دێت لەدایك دەبیت. لێرە دەچیتە دەرەوە و دەچیتە نـاو دونیایـەکی نوێوە.

– من دەترسم. نامەوێت لەدایکببم. ئێرە شوێنێکی زۆر باشە.

– حەز بکەیت یاخود نا هەر لەدایك دەبیت. بەڵێ غـەمگین مەبـە، دەرەوە زۆر لێرە خۆشترە.

– ئایا دڵنیایت؟

– بێگومان! کاتێك لەم شوێنە تەنگ و تاریکە دەرچوویت باشـتر تێدەگەیت. ئاسمانی شـین دەبینیـت. گـوڵ و گـوڵزار و ئەسـتێرەکانت خۆش دەوێت.

– مـن نـازانم ئاسمـان و گـوڵ و ئەسـتێرەکان چـین... مـن دەترسم!".



مرۆڤ لەو شتانەی نایانناسێت، دەترسێت. تاکە هۆکارێك وا لە کۆرپەیەك دەکات لە لەدایکبوون بترسێت، ئەوەیە هیچ زانیارییەکی نییە دەربارەی ئەو جیهانە نوێیەی چاوی پیاهەڵدێنێت.

بەڕای من ئەگەر کۆرپە پێش لەدایکبوون بیزانیایە دونیا چۆن شوێنێکە، ئەوا لەکاتی لەدایکبووندا بەو جۆرە نەدەگریا. بەڵکو بەوپەڕی لێوبەخەندەییەوە سڵاوی لە چواردەوری دەکرد.

بەڵێ وایە، لای کۆرپە لەدایکبوون بەواتای مردن دێت. وەلێ ئێمە دەزانین کە لەدایکبوون خۆشترین و باشترین شتێکە بەسەر کۆرپەی ناو سکی تەنگ و تاریکدا دێت.

ئێمەش هاوشێوەی کۆرپەی ناو سکی دایکێکین. چاومان بە دونیا هەڵهێنا و دونیامان خۆشویست. زانینی ڕاستی ئەوەی ڕۆژێک ئەم جیهانە بەجێدەهێڵین، ترس دەخاتە دڵمانەوە و دڵگران دەبین.

واتە وەک کۆرپەیەکی لەدایک نەبوو، ئێمەش لە مردن دەترسین. نامانەوێت ئەم ژیانە بەجێبهێڵین و دەخوازین تا کۆتا بەردەوام بین... وەلێ خودایەک کە کۆرپە لەناو سکی تەنگ و تاریکی دایکدا بەجێناهێڵێت، ئێمەش هەتا هەتایە لەم دونیایەدا ناهێڵێتەوە. بەڵکو کۆچ دەکەین بۆ جیهانێکی زۆر خۆشتر و فراوانتر.

هەروەک چۆن دونیا لە سکی دایک گەلێک فراوانتر و خۆشترە، بە پشتیوانی خودا ئەو بەهەشتەی بۆی دەچین لە دونیا زۆر خۆشتر و بەرینتر دەبێت.

بەڵێ مردن یان کۆچی دوایی بەو جۆرەیە.

# ئایا ئیزرائیل باشە یان ..؟

ئایا کە باسی فریشتە دەکرێت هیچی خراپ بە خەیاڵتدا دێت؟
ئایا قەت بووە بە کەسێکی خراپەکار بڵێیت: "دەڵێی فریشتەیت!"؟.
فریشتە دەستەواژەیەکە هەرگیز بەکارنایەت وەك ئاوەڵناوێك بۆ کەسی بکوژ، تاوانبار، دز، خیانەتکار، بێبەزەیی، دڕندە و ترسناك!
بەڵام لە وەسفی منداڵێکی ڕوومەت سوور و جوانکیلەدا دەڵێین: "هەر دەڵێی فریشتەیە" و ماچێکیشی دەکەین.
بۆ کەسانێك کە هەرگیز هەلی چاکەکاری لەدەست نادەن، دەستی یارمەتی بۆ کەوتووان درێژ دەکەن و هەڵیاندەسێننەوە، ئەسرینی چاو بە ئەسرینەکان دەسڕنەوە، دڵی منداڵان خۆش دەکەن و کاری باشی دیکە دەکەن، وەسفی "فریشتە" بەکاردەهێنین.
فریشتە وشەیەکی گەلێك جوان و بەنرخە و لە هەموو زمانەکانیشدا بەرامبەری هەیە!
بێ شك ئیزرائیلیش یەکێکە لە فریشتەکان!
هاوشێوەی فریشتەی سرووش "جبریل" ئەمیش فریشتەیەکە.

هاوشێوەی میکایل کە بە فەرمانی خودا بەهاران باخ و باخات و دۆڵ و کێو و دەشت و دەر یەکپارچە بە بەرگی گوڵ و گوڵزار و سەوزە و میوە و دەغڵ و دان دادەپۆشێت، ئیزرائیلیش فریشتەیەکە.

هاوشێوەی ئیسرافیل کە لە ڕۆژی دواییدا هەواڵی زیندووبوونەوە دەداتە یەك بە یەکی بوونەوەران، ئیزرائیلیش فریشتەیەکە.

وەك ئەو فریشتانەی لەکاتی خەودا خۆیان پیشانی منداڵان دەدەن و بە زەردەخەنەی سەر لێویان دڵخۆشیان دەکەن، ئیزرائیلیش فریشتەیەکە.

هاوشێوەی ئەو فریشتانەی دڵۆپەکانی باران و کلوی بەفر دەهێننە سەر زەوی، ئیزرائیلیش فریشتەیەکە.

ڕێك وەك ئەو فریشتانەی باڵندەکان فێری گۆرانی وتن دەکەن، هاودەمی مێروولە دەکەن، ڕێگە نیشانی مێش هەنگ دەدەن، دەچرپێنن بە گوێچکەی مانگادا و فەرمانی پێدەکەن "ئارام بە، با ئەو کیژۆڵەیە گوانت بدۆشێت و هەندێك شیر ببات"، ئیزرائیلیش فریشتەیەکە.

بەڵام ئەو ئەرکەی بەم سپێراوە ئەوانە نین کە باسمان کردن. بەڵکو ئیزرائیل، فریشتەی گیانکێشانە.



ئەو فریشتەیەیە کە هەموو کەسێك لەکۆتایی ژیانی ئەم دونیایـەدا دەیبینێت.

ئیزرائیل فریشتەیە و فریشتەش مانای چاکە، جوانی، بێگـەردی و ڕاستی دەبەخشێت.

ترسانمان لـە ئیزرائیـل تاڕادەیـەك بـەهۆی ئەوەوەیـە کەسـانێکی نەفام بەبێ زانیاریی و بەئارەزووی خۆیان وێنای نەشیاو بۆ فریشـتە و پێغەمبەران و تەنانەت خوداش دەکەن.

ئەوان وێنەی ئیزرائیل بەم شێوەیە دەکێشن: ئێسکە پەیکـەرێکی مــەزن و ســەرتاپا ڕەش پــۆش، داســێکی تیــژی بەدەســتەوەیە،

ڕووخسارێکی زۆر ترسناك و تۆقێنەری هەیەو بەم شێوەیە دێت بۆ گیانکێشانی مرۆڤ.

بەلاَم بێگومان ئەو وێنە ترسناکەی لە فیلمی ترسناك و کاریکاتێردا نیشان دەدرێت، دوور و نزیك هیچ پەیوەندییەکی نییە بە ئیزرائیلەوە کە یەکێکە لە چوار فریشتە مەزن و نزیکەکانی خودای گەورە.

خۆ کەسێکیش نەبووە دوای ئەوەی بینیبێتی دانیشێت وێنەکەی بکێشێت و پیشانی ئەوانی دیکەی بدات.

فریشتەی گیانکێشان (حەزرەتی ئیزرائیل) دوو ڕووی جیاوازی هەیە...

## دوو ڕووی جیاوازی ئیزرائیل...

ڕووخسارە جوان و شیرینەکەی ئیزرائیل (سەلامی خودای لەسەر بێت)، تەنیا لە بەرامبەر بەندە باشەکانی خودا دەردەکەوێت. ئەوانەی بڕوایان بە خودای تاقانە و پێغەمبەران هەیە، کاری چاکە دەکەن، هەوڵیانداوە زیان بەوانی تر نەگەیەنن و تەنانەت پێ بە مێروولەیەکدا نەنێن، ئەگەر کۆمەڵە گوناهێکی بچووك یان گەورەشیان کردبێت پاشان پەشیمان بوونەتەوە و تۆبەیان کردووە، لەدوا ساتەکانی ژیانیاندا ڕووی جوانی حەزرەتی ئیزرائیل دەبینن.

واتــه فریشــتەی گیانکێشــان بــەو جــۆرە دەچــێتە لایــان و دەڵێت:"ئیدی ئەرکی سەرشانت لەم دونیایەدا کۆتایی پێهات. وەرە با بتبەم بۆ بەهەشتی هەتاهـەتایی، چیتر ڕووبەڕووی ناڕەحـەتی ژیان نابیتەوە".

وەك پێغەمبــەری ئــازیز ﷺ ئامــاژەی بــۆ دەكـات كـە هێنـدەی ئاسـانیی دەرهێنـانی تاڵـە مـوو لـە ڕۆنەكـەرە، گیـانی لـە جەسـتەی شەكەتی دەستی نەخۆشیەكانی ئەم ژیانە دەكێشرێت.

بەڵام بێگومان فریشتەی گیانكێشەر ڕوویەكی دیكەشی هەیە. ئەم ڕووخسارەیان ڕووخسارە ترسناكەكەی ئەوە.

دەڵێن ئیبراهیم پێغەمبەر (سـەلامی خـوای لـێ بێـت) ویسـتویەتی ئەم ڕووەی ئیزرائیل ببینێت، پێی وتووە:

"خۆتم پێ نیشان بدە، بزانم!".

"تۆ ناتوانیت خۆت لەبەردەم ئەو ڕووخسارەی مندا ڕابگریت".

بەڵام لەسەر پێداگریی حەزرەتی ئیبراهیم (سەلامی خـوای لەسـەر بێت)، فریشتەی گیانكێشان ڕووخساری ترسناكی خۆی نیشان داوە.

ئیبراهیم پێغەمبەر(سەلامی خوای لەسەر بێت) كاتێك فڕێدرایە ناو ئاگرەكەشەوە نەترسا، وەلێ بە بینینی ڕووخساری ترسناكی ئیزرائیل هێندە ترسا كە لەهۆش خۆی چوو.

ئەم ڕووخسارە ترسناكەی فریشتەی گیانكێشان –خودا بـەدووری بگرێت لێمان– تەنیا بۆ ئـەو كەسانە دەردەكـەوێت كـە بـوونی خـودا

ڕەتدەکەنەوە و بڕوایان بە میهرەبانی و سۆزی هەمیشەیی ئەو نییە، بڕوایان بە پێغەمبەران و کتێبە ئاسمانییەکان نییە و دژایەتیان دەکەن، ستەم دەکەن و خوێنی بێتاوان دەڕێژن، دەستدرێژی دەکەنە سەر ماف و ماڵ و موڵك و پیرۆزییەکانی ئەوانی تر، ماڵی هەتیو دەخۆن، لەبەر مەرامی ناپاکانەی خۆیان تۆوی دووبەرەکی و ئاژاوە لەنێوان خەڵکیدا دەچێنن.

چونکە خوای باڵادەست چاوپۆشی لە ستەمی ئەوان ناکات و نادادگەری لەگەڵ ستەملێکراودا ناکات!

ئیدی بەم جۆرە ئیزرائیل نەك بە ڕووخسارە ئاساییە جوانەکەی خۆی، بەڵکو بە ڕووخسارێکی ترسناکەوە دەچێتە لای ستەمکاران و گیانیان دەکێشێت. ئەوکات ئیدی کەسەکە دەزانێت ڕۆژی لێپرسینەوە و وەرگرتنی سزای تاوانەکانی هاتووە. چیتر گریان وناڵەو هاوار لە ستەملێکراوەوە دەگوازرێتەوە و دەبێتە بەشی ستەمکار. هەروەها بۆ هەتاهەتایە ئەوان دەناڵێنن و ستەملێکراوانیش پێدەکەنن.

## ئیزرائیل، هاوڕێیەکی متمانەپێکراو

ئومێد دەکەین خوای بەخشندە بمانخاتە ڕیزی ئەو کەسانەی ڕووخساری ترسناکی ئیزرائیل نابێتە بەشیان.

چونکە لەکۆتایی ئەم ژیانەدا، ڕێبوارییەکی دووروودرێژ چاوەڕوانمان دەکات. لەو ڕێبوارییەدا هاوڕێیەکی متمانەپێکراومان پێویستە.

فریشتەی ئیزرائیل لەو هاودەمە متمانەپێکراوانە. ڕۆحمان لەنێوان باڵە نوورانیەکانی ئەودا پارێزراو دەبێت.

ئەم دیمەنە لەوکاتە دەچێت کە کۆرپە لە سکی تەنگ و تاریکی دایکدا هەست بەوپەڕی بێچارەیی دەکات و لەناکاو خۆی لەنێوان هەردوو دەستی مامانێکی شارەزا و بەسۆزدا دەبینێتەوە.

ئەمەش یەکێکی دیکەیە لە وێکچووەکانی مردن و لەدایکبوون.

وەك چۆن مامان یارمەتیمان دەدات بێینە ئەم دونیایەوە، هەرواش فریشتەی گیانکێشان یارمەتی گیانمان دەدات لە جەستەی شەکەت و نەخۆشمان بچێتە دەرەوە بەرەو دونیایەکی جیاوازتر.



ئەو فریشتەی متمانەپێکراوی خودای تاقانەیە و دێتە ڕاسەرمان بۆ ڕادەستکردنەوەی مەزنترین و بەنرخترین ئەمانەت کە ئەویش ڕۆحمانە.

وەك پێچانەوەی کۆرپە بە قوماشێکی ئاوریشمی نەرم تاکو جەستەی ئازار نەدات لەلایەن مامانەوە، ئەویش گیانمان دەپێچێتەوە و دەیبات بۆ نیشتیمانی هەمیشەییمان –بەهەشت– و ئەو جیهانە دڵڕفێنەی چاوەڕوانمان دەکات.

بۆیــە ئێمــەی بــڕوادار و موســوڵمان پێویســتە هاوشــێوەی فریشتەکانی دیکە ئیزرائیلمان خۆشبوێت و ڕێزی لێ بگرین.

## چەند دانە ئیزرائیل هەیە؟

ڕۆژانە لەسەر زەوی هەزاران مرۆڤ دەمرن، ئەمە لەلایەک، لەلایەکی دیکەوە هەزاران و ملیۆنان بەدیهێنراو و گیانەوەری دیکەش ماڵئـاوایی لە ژیان دەکەن.

فیلی دارستان، شێری ناو بێشە، زێبرا و کەڵەکێوی... گیانلەبەرە ئاوییەکانی ناو دەریا و زەریاکان... باڵندەی سەر پەلی درەختەکان... دووپشکی بیابان... پەنگوینی قوتبەکان... مێش هەنگەکان... ئەو کرمانەی دەبن بەژێر پێوە، مێروولەکان، سیسرکەکان...

هـەروەها ئێوارەیـەکی فێنکـی مـانگی ئـەیلول، سیسـرکێك پـاش



گـــۆرانی وتنێکـــی زۆر بەســـەر پـــەلی دارهەرمێیـــەکی پـــیرەوە مرداردەبێتەوە...

ئەگەر ئیزرائیل گیانی تەواوی بوونـەوەران دەکێشـێت – تـۆ هـەر واز لە گیانلەبەرانیش بێنە، ئەم هەموو مرۆڤـە لـە جیهانـدا لـە هـەمان کاتـدا دەمـرن– ئـیتر فریشـتەی گیانکێشـان چـۆن بـە تـەنیا خـۆی پێڕادەگات؟

فریشـــتە بوونەوەرێکـــە لـــە ڕوونـــاکی بـــەدیهێنراوە. لەبەرئـــەوە هاوشـــێوەی ئـــەو بوونەوەرانـــەی لـــە گۆشـــت و خـــوێن و ئێســـقان پێکهاتوون، پەیوەست نییـە بـەوەی لەکاتێکـدا تـەنیا لـە یـەك شـوێن بێـت. لەیـەك کاتـدا دەتوانێـت لـە چـەند شـوێنی جیاوازبێـت. ئێسـتا نموونەیەکت بۆ دەهێنمەوە:

خـــۆر لـــە ژمارەیـــەکی زۆر گـــەرد و گەردیلـــە پێکـــدێت. بـــەڵام لەبەرئەوەی تایبەتمەندی تیشـکدەرەوەی هەیـە، بۆیـە تاڕادەیـەك بـە نووریش دادەنرێت.

لەکاتێکدا تیشـکی خـۆر گـۆی زەوی ڕوونـاك دەکاتـەوە، هاوکـات ئەستێرە و هەسارەکانی دیکەش ڕووناك دەکاتەوە.



تیشکی خۆر بە گەرمی و ڕووناکیەکەیەوە لەسەر پەڕەی ملیۆنـان گـوڵ دەردەکـەوێت و لـە بیلبیلـەی چـاوی هـەموو گیانەوەرەکانـدا دەبریسکێتەوە.

واتە بـوونی لـە جێگایـەك نابێتـە بەریەسـت لەبـەردەم بـوونی لـە جێگایەکی دیکە.

هەم دەریا و زەریاکان ڕووناك دەکاتەوە، هەم چیا و دۆڵەکان...

بە ڕووناکیەکەی هەم مێرووەکان دەبینن هەم منداڵان...

لمی کەنار دەریاکان گەرم دەکات و پشتی خەباتکاریکیش داخ دەکات.

خۆر تەواو نوور نییە، بەڵکو نیوەی ماددە و نیوەی ڕووناکی (نوور)ە، ئەگەر خۆرێك بۆی بکرێت بەم شێوەیە بکات، ئەدی فریشتەیەك کە یەکپارچە نوورە ناتوانێت لەهەمان کاتدا لە چەند شوێنێکی جیاواز بێت؟ بێگومان بەڵێ!

ئەم سەردەمەی ئێستا زۆر لەبارە بۆ تێگەیشتن لە گونجاویی بوونی فرەشوێن لەهەمان کاتدا. چونکە ئێستا ئامێری وەك تەلەفزیۆن هەیە: لەهەمان کاتدا مرۆڤ دەتوانرێت لە ملیۆنان شوێنی جیاواز ببینرێت. ئەگەر پێنج سەد ساڵ لەمەوبەر کەسێك بیوتایە: "ڕۆژێك دێت، سەرۆکی وڵات لە کۆشکەکەیەوە قسەدەکات و ملیۆنان مرۆڤیش لە ماڵەکانی خۆیانەوە گوێبیستی دەبن"، ئەوا تەنیا بە گەمژەو بێ ئەقڵ لە قەڵەم دەدرا. بەڵام دەبینین بۆ ئەمڕۆ چەند شتێکی ئاساییە...

وا هەست دەکەم ئەم دوو نموونەیە یارمەتیدەرن بۆ تێگەیشتن لە بوونی فریشتە ئیزرائیلی لە نوور دروستکراو لە چەند شوێنی جیاواز لەهەمان کاتدا.

بەڵام شتێك هەیە نابێت بیرمان بچێت:

هەندێك لە زانایانی ئیسلام لەبەر ڕۆشنایی تێڕوانینمان بۆ ئایەت و فەرموودەکان، پێیان وایە خودای تاقانە ئەرکی بە ژمارەیەکی زۆر فریشتە سپاردووە بۆ گیانکێشان و ئیزرائیلیش سەرکردەی ئەوانە.

بێگومان ڕاستی تەواوی هەموو شتێك خودای بەدیهێنەری مرۆڤ و فریشتەکان دەیزانێت...



# ئایا کە مردین ئیدی چیمان بەسەر دێت؟

دەزانم سەرت لە وەڵامی ئەم پرسیارە سوڕدەمێنێت، وەلێ گەر بەباشی گوێم بۆ هەڵخەیت ئەوسا تێدەگەیت من ڕاست بووم...

کاتێک مردین هیچمان بەسەر نایەت! هەروەک خۆمان دەمێنینەوە، ئەوەی کە ڕوودەدات بەسەر جەستەماندا دێت. ئەمە لەکاتێکدا ئەو شتەی بەڕاستی ئێمەی کردووە بە ئێمە، جەستەمان نییە.

دەزانم، نیشانەی پرسیار لە مێشکتدا گەورەتربوو، ئێستا نموونەیەکت بۆ باس دەکەم، کەیفت پێ دێت و تێشدەگەیت من مەبەستم چی بووە.

ئایا تۆ قەت ئەستێرەوانت بینیوە؟

قەت ئەستێرەوانت لەنزیکەوە نەبینیوە بەڵام لە فیلمدا زۆر بینیوتە.

کێشە نییە، ئەمەندەش هەر باشە!

ئەستێرەوانە گەڕۆکەکان کاتێک دەچن بۆ بۆشایی ئاسمان جلوبەرگێکی تایبەتی لەبەردەکەن. چونکە هەلومەرجی بۆشایی ئاسمان لەبارنییە بۆ پیاسەکردن بە کراس و پانتۆڵێکەوە.



جلوبەرگی
بۆشایی ئاسمان
بەشێوەیەکە کە
جەستەی
ئەستێرەوانەکە
هیچ دیار نییە.
بەڵام کە دێنەوە بۆ
سەر زەوی، ئیدی
ئەو جلە قورس و زەبەلاحە دادەکەنن.

باشە من پرسیارێکت لێ دەکەم: کاتێک هاتەوە سەر زەوی و پۆشاکی بۆشایی ئاسمانی داکەند، هەر ئەستێرەوانە یان نا؟

بێگومان هەر ئەستێرەوانە!

واتە بەبێ ئەو جلوبەرگە ئەستێرەوان هەر ئەستێرەوانە، وانییە؟

بێگومان!

ئەدی جلوبەرگەکە؟ جلوبەرگەکە ئەستێرەوانە؟

نەخێر، ئەو تەنیا پۆشاکێکە و بەس، دەزانم پۆشاکێکی زۆر جوان و تایبەتە، بەڵام دواجار پۆشاکێکی بێگیان و ڕۆحە. تا کەسێکیش لەبەری نەکات، هەر بەو شێوەیە دەمێنێتەوە.

ئێستا لە ڕوانگەی ئەم نموونەیەوە، سەیری جەستەی خۆت بکە.



خودای تاقانە و مەزن، سەرەتا لە جیهانی ڕۆحدا گیانی (ڕۆح)ی مرۆڤی بەدیهێنا.

کاتێك هاتینە جیهانی دونیاوە، پێویستمان بە پۆشینی بەرگێکی تایبەت بەم جیهانە هەبوو. ئیدی لە سکی دایکماندا جلوبەرگێکی تایبەت بە ئێرەمان بۆ دورا.

ئەم بەرگە دەستی هەبوو بۆ گرتن، قاچی هەبوو بۆ ڕۆیشتن، چاوی هەبوو بۆ بینین، گوێچکەی هەبوو بۆ بیستن، لووتی هەبوو بۆ بۆنکردن.

ڕاسته ئێمه بەم جلوبەرگە زۆر تایبەتەوە هاتینە دونیاوە، وەلێ ئێمە ئەو جلوبەرگە نین. هاوشێوەی ئەستێرەوان و پۆشاکەکەی، جەستە و گیانی ئێمەی مرۆڤیش دوو شتی تەواو جیاوازن.

هەر کە ژیانی دونیا کۆتایی پێ هات، ئەوکات ئێمە درێژە بە ژیانی جیهانی ڕۆح دەدەین.

پۆشاکە تایبەتیەکەی دونیا لەبەرمان دادەکەندرێت، چونکە ئەو جیهانەی بۆی دەچین پێویستی پێ نییە. کتومت وەك داکەندنی پۆشاکی بۆشایی ئاسمان لەلای ئەستێرەگەڕێکەوە کاتێك دەگەڕێتەوە سەر زەوی و پێویستی پێی نامێنێت.

جەستەمان بەجێدەهێڵین و ڕۆحمان بەرەو جیهانێکی دیکە دەچێت، کە (جیهانی گۆڕ)ە...

هەروەك چۆن کاتێك لە جیهانی ڕۆحەوە هاتینە دونیا، نۆ مانگ لە سکی دایکماندا چاوەڕوانمان کرد، هەر بەو جۆرەش کاتێك لە دونیاوە دەچینە بەرزەخ لە جیهانی گۆڕدا ماوەیەك چاوەڕوان دەکەین...

گۆڕیش وەك سکی دایك وێستگەیەکە، هۆڵێکی چاوەڕوانییە...

خودایەك کە لە سکی دایکدا ئێمەی بەتەنیا جێنەهێشت، بێگومان لە گۆڕیشدا تەنیامان ناخات.

چونکە زاتی ئەو خودای جیهانیانە. خودای جیهانی بەرزەخ و دونیا و قەبر و بەهەشتیشە.

بەڵێ، ئەمەش یەکێکی دیکەیە لە وێکچوونەکانی مردن و لەدایکبوون.



# جیهانی گۆڕ، شوێنێکی چۆنە؟

کاتێك لە تەمەنی ئێستای تۆدا بووم، لە گەڕەکەکەماندا خاتوو مامۆستایەکی زۆر بەسۆز و دینپەروەر بەناوی (پوورە مروەت)ەوە هەبوو. دایکم تکای لێکردبوو وانەی قورئان بە من و براکەم بڵێتەوە.

"مامۆستا ئەمە چەند پشووی هاوین تێپەڕی، منداڵەکان هێشتا وانەی قورئانیان نەخوێندووە؟".

"بە پشتیوانی خودا ئەمساڵ دەیخوێنین".

"خوا یاریێ، خوا یاریێ".

"بەڵام خۆ من تەنیا فێری خوێندنەوەی قورئانیان ناکەم...".

"ئەدی چی تریشیان فێردەکەیت؟".

"لەهەمان کاتدا زانیاریی ئایینیشیان پێ دەڵێم".

"مامۆستا، خودا لێت ڕازی بێت".

"خودا لە هەموومان ڕازی بێت".

پاش ئەم گفتوگۆیە ئیدی هەموو بەیانییەك لەگەڵ براکەمدا بە نامیلکەی "ئەلف بێ"ەکەوە بەرەو ماڵی "مروەت خان" دەچووین.

سەرەتا وانەی قورئانمان دەخوێند، پاشان مامۆستا پەڕەیەکی لە ڕۆژمێرەکە لێدەکردەوە و فەرموودە و ئەو پەندە ئایینییەی لەسەری نووسرابوو بۆمانی دەخوێندەوە.

دواتر بەپێی توانا زانیاریی دینی پێ دەوتینەوە.

ئای چەند خانمێکی باش و میهرەبان بوو! خودا هەردوو دونیای پڕبکات لە نوور.

ڕۆژێکیان وانەی قورئان و پەندی ڕۆژمێرەکە کۆتایی پێهات. ئێمەش خواخوامان بوو هەرچی زووە دەرس تەواو ببێت و بچینە کۆلان بۆ گەمەکردن. وەلێ مامۆستا وتی: "با ئەمڕۆ باسی جیهانی گۆڕ بکەین...".

دەستەواژەی "گۆڕ" گەلێك سەرنجی ڕاکێشاین.

پوورە مروەت دەستی کرد بە قسەکردن سەرەتا زۆر لەسەرخۆ و گفتشیرینانە باسی دەکرد، لەپڕ جۆش و خرۆشێك گرتی.

مامۆستا مروەت بیری چووبوو بۆ دوو منداڵ دەدوێت نەك ژنانی بێکاری گەڕەك!

"ڕۆڵەکانم! دواتر فریشتەیەك دێتە ناو گۆڕەکەمان، کوتەکێکی دڕکاوی پێیە و دەیکێشێت بەسەرماندا...".

کە باسی کوتەکی کرد بارودۆخی گۆڕا، ئێمەش زۆر پێکەنینمان پێدەهات و دەستمان گرتبوو بە ئەژنۆی یەکترییەوە تاکو زۆر لەخۆمان بکەین پێنەکەنین ئەویش بەوپەڕی گرنگییەوە بەردەوام بوو.

وانەکە تەواوبوو و هەرچۆنێك بێت خۆمان گەیاندە کۆلان. کە نەختێك دوورکەوتینەوە و دڵنیابووین لەوەی مامۆستا نایبیستێت، کەوتینە قاقا لێدان و پێکەنین.

چەند ڕۆژێك بەردەوام لاسایی ئەومان دەکردەوە، جارێك من و جارێك براکەم دەبووینە مامۆستا و دەمانوت: "فریشتەکە بەهەرچی هێزێتی کوتەکەکەی دەستی دەکێشێت بەسەرماندا و دەڵێت: دەی بۆ ناخی زەوی." ئیدی ئەمە بووبووە سەرچاوەی پێکەنین بۆمان.

هەرچەندە زۆر پێی پێدەکەنین وەلێ بابەتی کوتەکەکە بووبووە خولیای سەرمان... بێشك ئێمەش وەك هەرکەسێکی دیکە ڕۆژێك دەمرین و دەچینە قەبرەوە، ئایا هەر دەبێت ئەو کوتەکە بخۆین؟

هەرچەندە ئەو سەردەمە بیرۆکەیەکی ئەوتۆم نەبوو، بەلام پێم وابوو هەر دەبێت ڕێگە چارەیەك بۆ قوتاربوون بدۆزینەوە.

بەڕای من یان مامۆستا مروەت ناتەواو باسی کرد یاخود لەبەرئەوەی بەردەوام مێشکمان لای چوونە کۆلان بوو ئێمە گوێمان نەدابووە تەواوی وتەکانی ئەو. هەرچۆنێك بێت سالانی داهاتوو گەلێك شت لەبارەی جیهانی گۆڕەوە فێربووم. چەندین زانیاری ئەوتۆ کە ناخمی ئاسوودە کرد.



## ئایا بۆچی مردووەکان نابینین؟

پێغەمبەر باوکە ئادەم (سەلامی خوای لەسەر بێت) دوو کوڕی هەبوو. یەکێکیان ناوی هابیل و ئەوی دیکە قابیل بوو. ڕۆژێك هابیل و قابیل کەوتنە دەمەقاڵە. لەڕاستیدا قابیل دەمەقاڵەکەی دروستکرد، چونکە زۆر لە براکەی تووڕە بوو. کێشەی نێوانیان هێندە گەورەبوو تاکو گەیشتە ئەوەی قابیل هابیلی کوشت. ئەمەش یەکەم کوشتنی مرۆڤ بوو لەسەر زەوی.

پاشان قابیل زۆر دڵگران بوو بە کوشتنی هابیل و لەسەر تەرمەکەی دەستی کرد بە ڕشتنی فرمێسکی پەشیمانی. ئەمە وێڕای ئەوەی نەیدەزانی چی لە جەستەی بێگیانی براکەی بکات!

لەم نێوەندەدا چاوی بە ڕووداوێك كەوت: ئەویش ناشتنی تەرمی قەلەڕەشێكی مرداربووەوە بوو لەلایەن قەلەڕەشێكی دیكەوە.

وتی: "باشترە منیش وەك ئەو قەلەڕەشە تەرمی براكەم بخەمە ژێر گڵەوە".

ئەمە پەندێك بوو خودای زانا نیشانی دا، ئەگەرنا قەلەڕەش چۆن بزانێت دەردی قابیل چیە و دەرمانی بۆ پەیدا بكات.

ئیدی لەو ڕۆژەوە، مرۆڤی مردوو بەخاك دەسپێردرێت، خۆ دروستكردنیش هەر ئەمەیە و ئاشكراشە خودا جەستەی ئێمەی لەگڵ دروستكردووە. چی لەوە دروستترە، دوای دەرچوونی ڕۆح، جەستەی لە خاك دروستكراومان بخەنە ژێر خاكەوە؟

جەستەمان لە خاكەوە هاتووە باشتر وایە هەر بچێتەوە بۆ باوەشی ئەو.

## ئەریٚ ڕۆحمان چی بەسەردێت؟

جەستەمان لە خاكەوەیە وەلیٚ ڕۆحمان نا! خۆ لەبەرئەوەی كاتێك مرۆڤ دەمرێت ڕۆحی لە جەستەی جیادەبێتەوە، بۆیە ڕۆحەكەی لەگەڵ جەستەكەیدا ناخرێتە گۆڕەوە.

بەكورتی كاتێك دەمرین: جەستەمان دەخرێتە گۆڕەوە و ڕۆحیشمان دەچێتە جیهانی بەرزەخەوە.

جیهانی بەرزەخ لەم دونیایە ناچێت. ئێمە تەواو نازانین بارودۆخی ئەو دونیایە چۆنە. هەروەك چۆن بەر لە لەدایكبوون نازانین دونیا چۆنە، هەرواش تاكو نەمرین زانیارییەكی ئەوتۆمان نابێت لەسەر جیهانی بەرزەخ.

بەلام نێردەی خودا بۆ ڕێنموونی كردنی گرۆی مرۆ پێغەمبەرﷺ باسی جیهانی گۆڕی بۆ كردووین و هەر زانیارییەكمان هەبێت لەوەوەیە.

## لە جیهانی گۆڕ چی دەكەین؟

پێغەمبەری خۆشەویستمانﷺ باسی جیهانی گۆڕمان بۆ دەكات و تێمان دەگەیەنێت: مرۆڤ كە دەمرێت ڕۆحی جیادەبێتەوە بەرەو جیهانی گۆڕ دەچێت، لەوێ لەلایەن دوو فریشتەوە پێشوازی لێ دەكرێت.

یەكێك لەم فریشتانە ناوی نەكیرە و ئەوی تریش مونكەر.

نەكیر و مونكەر لەسەرەتای ئەم جیهانەدا چەند پرسیارێكمان لێدەكەن. چەند پرسیارێكی وەها ئێستا بەلای تۆوە زۆر ئاسانن.

"خودات كێیە؟".

"پێغەمبەرەكەت كێیە؟".

"دینت كامە دینە؟".

وەك دەبينيت: پرسيارى خوات كێيە، پێغەمبەرت كێيە، دينت كامە دينە، بۆ كەسێكى وەك تۆ كە شارەزاى دينەكەيەتى گەلێك ئاسانە.

كاتێك دوو فريشتەى ئەرك پێسپێردراو وەڵامى ڕاست وەردەگرن، پێى كەيف خۆش دەبن و دەڵێن:"خۆ هەر دەمانزانى وەڵامى ڕاست دەدەيتەوە". چونكە فريشتەكان مرۆڤى باوەڕداريان خۆشدەوێت.

مرۆڤى باوەڕدار بە خودا و بە پێغەمبەر و خۆشەويستى ئەوان، هەميشە دۆستى فريشتەيە. بەپێچەوانەشەوە فريشتەكانيش دۆستى ئەو مرۆڤانەن.

## مژدە! مژدە!

كاتێك دەركەوت دۆستى فريشتەكانين، ئيدى هەواڵێكى دڵخۆشكەر و مژدەيەكى ناوازە چاوەڕوانمان دەكات. ئەم مژدەيە لە هەرچى مژدەى خۆشى دونيا هەيە خۆشترە.

ئەويش ئەوەيە: بەپشتيوانى خودا لەناو گۆڕدا دوو فريشتەى دۆستى نزيكمان نەكير و مونكەر بە خەندەيەكى نوورانيەوە هەواڵى بەهەشتيبوونمان پێ دەدەن.



ئیدی لەو ساتەوە ناوگۆڕی تەنگ و تارمان بۆ دەبێتە کۆشکێکی ڕازاوە بە گوڵ و گوڵزار و باخچەی دڵڕفێن. لەوێ تاکو ڕۆژی دوایی و لێپرسینەوە دەرچەیەکمان بۆ ئاوەڵا دەکرێت تاکو لێوەی تەماشای کۆشك و تەلار و ڕووبارەکانی و چەندین بەخششی دیکە، کە لە خەیاڵماندا جێگەیان نابێتەوە، بکەین. بەوپەڕی دڵخۆشیەوە خەوێکی قووڵمان لێدەکەوێت و خەون بە جوانییە سەرسوڕهێنەرەکانی بەهەشتەوە دەبینین.

بڕوانـە، خـودای بەدیهێنـەری گـرۆی مـرۆ و فریشـتە لـە قورئـانی پیرۆزدا چۆن باسمان بۆ دەکات.

(بەڕاستی ئەو کەسانەی وتوویانـە: پـەروەردگاری ئێمـە زاتـی خوایـە و، پـاش ئـەو دان پیانانـەیان لەسـەر بـاوەڕ بـەو قسـەیان و فەرمانبـەرداری کردنـی خـوا بـەردەوام بوون، ئەوانـە فریشـتە دێنـە خوارەوە بۆ سەریان و پێیان ئەڵێن: لە هیچ مەترسن و خەفەتی هیچ مەخۆن و خۆش مژدە بن بەو بەهەشتەی لەسەر زمانی پێغەمبـەران گفتتان پێئەدرا کە بۆتان ئەبێ. هەروا پێیان ئەڵێن: ئێمـە لـە ژیـانی دنیاو لە قیامەتا دۆستی ئێوەین) فصلت: ٣٠-٣١.

## ئەدی ئەوانەی وەڵامی هەڵە دەدەنەوە چییان بەسەر دێت؟

بەداخەوە هەندێ هەیە وەڵامی هەڵە دەداتەوە و هەیـە هـەر هـیچ وەڵامی بۆ نادرێتەوە...

لەسەر ئەم زەوییە مرۆڤ گەلێك هەن وێڕای سود وەرگرتن لە ناز و نیعمەتی ئاسمان و زەوی، خـواردن و خواردنـەوە، گـەڕان و سـەیران، وەلێ بەرامبەر بەدیهێنەریان ئەوپەڕی سپڵەن.

سەرکەشی دەکەن و نایانـەوێت بـاوەڕ بـەخودای تاقانـە بهێـنن و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بن.

نــە ڕەچـاوی ئایەتــەکانی قورئـان دەکــەن نــە فــەرموودەکانی پێغەمبەر.

بە قەست کاری خراپ دەکەن و لێی پاشگەز نابنەوە.

کاتێکیش وەك هـەر مرۆڤێکـی دیکـە مـەرگ بـەرۆکیان دەگرێـت و لـەگۆڕدا ڕووبـەڕووی نـەکیر و مونکـەر دەبنـەوە، نـاتوانن وەڵامـی پرسیارەکان بدەنەوە.

بێشك وەك یەك نین ئەوانەی بەڕاستی وەڵام دەدەنەوە و ئەوانەی بێ وەڵامن.

دوو فریشتەکە بە ئەندازەی دۆستایەتیان بۆ بەندە باوەڕدارەکان، دوژمنایـەتی بێبـاوەڕ و نـەیارانی ئـایینی خـودا و پێغەمبەرەکەشـی دەکەن.

بەخێرهاتنی ئەوان ناکرێت...

مژدەی بەهەشتیان پێ نادرێت...

دەرچەی تەماشاکردنی باخچەکانی بەهەشتیان بۆ ئاوەڵا ناکرێت...

دروستتر بڵێین، جیهانی گۆڕ بـۆ بـاوەڕدار چـەند خـۆش بێـت، بـۆ ئەوان هێندە ناڕەحەتە و بەپێچەوانەشەوە...

خودایـە! ئێمـە بگێڕیـت لەوانـەی لـە گـۆڕدا نـەکیر و مونکـەر دۆسـتایەتیان دەکـەن! یارمـەتیمان بـدەیت بـە ئاسـانی وەڵامـی پرسیارەکانیان بدەینەوە!

شەرمەزاری لای خۆت و ئەوانمان مەکە!

جیهانی گۆڕمان بۆ بکەیتە دەرچەی ڕێگایەکی کورت و تەخت بۆ گەیشتن بە بەهەشتی بەرین.

خودایە، ئەم نزایانەمان بۆ ئەو هاوڕێ و خۆشەویستانەشمان قبوڵ بفەرموو کە پێشتر کۆچیان کردووە و ئێستا لە گۆڕدان...

ئامین!



# ڕۆژی دوایی "قیامەت" چۆن بەرپادەبێت؟

کاتێك دەمرین و ئەم دونیایە بەجێدەهێڵین، ژیانی دونیا هەر بەردەوام دەبێت و ڕەوتەکەی ناوەستێت.

هەورەکانی ئاسمان دێن و دەچن و وەرزەکان بەدوای یەکتردا دێن.

لە وەرزی بەهاردا پەلی درەختەکان چرۆ دەکەن، بۆن و بەرامی گوڵ و وەنەوشە و هەناسەی نێرگز تێکەڵ دەبن.

گوڵە گەنمەکان لەژێر تینی گەرمی هەتاوی هاویندا زەرد دەبن... جوتیارانی گوند بۆ تاوێ حەسانەوە لەژێر سێبەری درەختێکی خوار ئاواییدا پاڵی لێ دەدەنەوە.

میوە پێدەگات... سێو، گێلاس، تووی سوور و سپی، هەڵووژە و، هەنجیری هەنگوینی...

شەوان ئاسمان سایەقەیە و مانگ هەڵدێت، ئەستێرەکان بەدەم منداڵانی خەو لێزڕاوەوە بزە دەکەن...



چۆلەکەکان دەجریوێنن و هەنگەکان هەنگوین دروست دەکەن...

موسوڵمانان نوێژ دەکەن و حافزەکان قورئان دەخوێننەوە...

خەڵکی بە پیر و جوانەوە دەمێک پێش نوێژ چاوەڕوانی بانگ دەکەن.

پیاوان دەچنە سەر کار و ژنان بەدەم گۆرانی وتنەوە پرچی درێژی کچەکانیان شانە دەکەن.

واتە هەرچەندە ئێمە کاتێک دەمرین دونیا بەجێدەهێڵین، بەڵام ژیان وەک خۆی بەردەوام دەبێت.

بەڵام ئەمە تا سەر درێژە ناکێشێت.

چونکە دونیاش وەك هەر شتێکی دیکە کۆتاییەکی هەیە. ڕۆژێك دێت ئەویش دەمرێت. بە مردنی دونیا دەوترێت ڕۆژی دوایی واتە قیامەت.

## ڕۆژی دوایی چۆن دادێت؟

مردنی دونیا ڕووداوێکی ترسناکە. وەلێ خۆشحاڵی لەوەدایە کە هیچ بەندەیەکی سەر ڕاستی خودا ئەو ڕۆژە نابینێت.

چونکە بەر لە ڕوودانی ڕۆژی دوایی، بە فەرمانی خودا ڕۆحی تەواوی ئەوانەی باوەڕدارن ئەگەرچی بە ئەندازەی نووکە دەرزیەکیش ئیمان لەدڵیاندا بێت– دەکێشرێت و تەنیا بێباوەڕان ڕۆژی دواییان بەسەردا دێت.

پێغەمبەرمانﷺ لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێت: ئەو مرۆڤە خراپەکارانەی قیامەتیان بەسەردا دێت و دەیبینن، تەنانەت لەوانەی سەردەمی نەفامی کە کچەکانیان زیندە بەچاڵ دەکرد خراپترن.

باشترین سەرچاوە بۆ چنگخستنی زانیاری دەربارەی ڕۆژی دوایی، بریتییە لە قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺ.

بەپێی فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺ کاتێك فریشتە "ئیسرافیل" فوو دەکات بە (صوور)دا، قیامەت هەڵدەستێت.

## ئێ باشە (صوور) چیە؟

ڕۆژێکیان کەسێك هاتە خزمەتی پێشەوامان و پرسی: "ئایا صوور چیە؟". پەیامبەری مەزنیشﷺ بەم شێوەیە وەڵامی دایەوە: "کەڕەنایەکە[2] فووی پێدا دەکرێت".

ئەوەندەی لێی تێدەگەیت صوور لەسەر شێوەی ئامێرە مۆسیقییە فوولێکراوەکانە. بەڵام پێویستە بڵێین (صوور) بەتەواوی چۆنە و چۆن دەنگێکی لێوە دەردەچێت، ئەمەیان نەزانراوە و زانیاریمان لەبارەیەوە نییە.

وەلێ بێشکێن لەوەی بوونی هەیە و بە ئاشکراش لە قورئان و فەرموودەدا ئاماژەی پێکراوە. هەروەها گومانمان نییە لەوەی ڕۆژێك دادێت فریشتەیەکی پایەبەرز بەناوی (ئیسرافیل)ەوە فووی پێدا دەکات و بانگی هەڵسانی ڕۆژی دوایی دەدات بەگوێی بوونەوەران و، چیا و تاشە بەردەکان و، هەسارە و ئەستێرەکاندا...

(جا کاتێ کە یەك فوو پیاکردن فووکرا بە (صوور)دا. زەوی و شاخەکانیش لە جێی خۆیان هەڵگیران و بەیەك جار دران بەیەکا، لەو ڕۆژەدا ئەوەی ڕوونەدا، ڕوونەداو، ڕۆژی قیامەت بەرپا ئەبێ.) الحاقة: ١٣-١٥.

---

٢ – کەڕەنا بۆرییەکە کاتێ فووی پێدا دەکرێ دەنگێك دروست دەکات.

کاتێك فوو کرا بە (صوور)دا و قیامەت هەستا ئیدی دونیا بەشێوەیەکی لێدێت کە ترسناکترین فیلمە سینەماییەکانیش لەچاویدا هیچ نین.

هەر کە ئەو ئایەتانەی قورئان دەخوێنینەوە کە باسی ڕۆژی دوایی دەکەن، ئەوجا تێدەگەین لە گەورەیی چاکەی نیشاندانی ڕووداوەکە لەلایەن خوداوە بە بەندە چاکەکارەکانی.

(ڕۆژێ کە زەوی دێتە لەرزەو تەکان دان و چیاکانیش تۆز و لمی بلاوبووەوەن، کە ئەو ڕۆژەیش ڕۆژی قیامەتە.) المزمل: ١٤.

(کە ڕۆژ پێچرایەوە، واتە هەڵگیرا یا تیشکی نەما و، کە ئەستێرەکانیش لێلْ بوون و، کە چیاکان خرانە ڕێ، وەك پەڵە هەورێ با بە ئاسمانا بیگێڕێ و، کە وشتری ئاوسی نزیکەزان بەرەڵلا کرا واتە خاوەنەکەی لەبەر دەردی خۆی نەیئەپەرژایە سەری). التکویر: ١-٤.

(کاتێ کە ئاسمان درزی برد و، کاتێ کە ئەستێرەکان پرژوبلاو بوونەوە و، کاتێ کە دەریاکان هەڵقوڵێنران و هەموو بوون بە یەك دەریا و، کاتێ کە گۆڕەکان ژێرەوژوور کران، هەموو کەسێ ئەزانێ چ کارێکی چاك یا خراپی بۆ خۆی پێش خستووە و لە پێش مردنیا کردوویە و چ کارێکی نەکردووە). الأنفطار: ١-٥.



## ئایا کەی ڕۆژی دوایی دێت؟

دەربارەی ئەم پرسیارە بەتایبەتی لەم چەند ساڵەی دواییدا قسە و قسەلۆک زیادی کردووە. بێگومان تۆیش بیستوتن. بەجۆرێك هەندێك کەس وا خۆیان نیشان دەدەن کە بەتەواوی بەرواری قیامەت دەزانن! کەسانێکیش ئەمەیان بە هەل زانی و هاتن لەو ڕوانگەیەوە پەرتووکیان نووسی و فیلمیان بەرهەم هێنا، پارەیەکی باشیشیان قازانج کرد. وەلێ ڕاسترین وەڵام ئەمەیە: تەنیا خودای زانا و تاقانە دەزانێت کەی ڕۆژی دوایی دێت.

(بێگومان هەر خوا خۆی ئەزانێ کەی ڕۆژی قیامەت دێ).
لقمان: ٣٤.

خۆ لەکاتی خۆیشیدا هاوەڵان پرسیاری ڕۆژی دواییان لە پێغەمبەرمانﷺ کردبوو. وەلێ خودای زانا و حەکیم لەڕێگەی پێغەمبەرەوە ڕۆژەکەی بە بەندەکانی ڕانەگەیاندووە.

(ئەی پێغەمبەر! لە بارەی قیامەتەوە لێت ئەپرسن: کەی دێو دائەمەزرێ؟ تۆ لە چ پایەیەکدای تا بزانی قیامەت کەی ئەبێو کەی نابێ؟ سەرەنجامی ئەم باسە بۆ لای خوا خۆی ئەگەڕێتەوە و ئەو پێی ئەزانێ. تۆ تەنها ترسێنەرێکی بۆ هەرکەسێ لە هاتنی قیامەت بترسێ تا خۆی بۆ ئامادە بکا بە گوێ ڕایەڵ کردن بۆ فەرمانەکانی خوا.) النازعات: ٤٢-٤٥.



# ئایا لەدوای مردن
# چۆن زیندوو دەبینەوە؟

پـەڕەی بـەهار لـە پـەرتووکی مـەزنی زەوی بـە تیـپ و وشـە و دەسـتەواژە نەخشـینەکانی ناویـەوە، وەڵامـی ئەوانـە دەداتـەوە کـە دەپرسن: "ئایا دوای مردن چۆن زیندوو دەبینـەوە؟" و دەڵێـت: "ئـا بەم شێوەیە زیندوو دەبنەوە".

"هاوشێوەی زیندووبوونەوەی پەلی وشك هەڵگەڕاوەی درەخت بـە گەڵاو گوڵ و بەرەکانەوە لە وەرزی بەهاردا...

وەك ئەو تۆوە مردووەی نوقمی خاك دەبێت، پاشان گوڵ دەکـات و دەبێتـە گـەنم و، کاڵـەك و شـووتی و زەردەخەنـە بـەڕووی دونیـا دەکات...

بەوێنەی دەرچوونی پەپوولە لە قۆزاخەکـەی، خـودای باڵادەسـت ئێمەی مرۆڤیش زیندوو دەکاتەوە!"

لە سەردەمی خۆشگوزەرانیدا یەکێك لـە هـاوەڵان لـە پێغەمبـەری نازداری ﷺ پرسی: "ئەی پێغەمبەری خـودا، ئێمـە دوای مـردن چـۆن زیندوو دەبینەوە؟ ئایا نموونەیەك بۆ زیندووبوونەوە هەیە؟

سەردارمان ﷺ لە وەڵامدا وتی:

"ئایا قەت نەتبینیوە ئەو دۆڵەی قەومەکەتی لێ دەژی سەرەتا ڕووتەن و وشك بوو بێت و پاشان یەکپارچە سەوز بووبێت؟".

"بەڵێ دیومە!".

"ئەوە ئیدی نموونەیەکە بۆ زیندووبوونەوە، خودای تاقانە هاوشێوەی ئەو مردوو زیندوو دەکاتەوە".



وەرزی بەهار لێوان لێوە لە نموونەی زیندووبوونەوە.

وەرە با پێکەوە ژیریی و دڵمان لەگەڵ خۆمان ببەین و لەم وەرزی بەهارەدا گەشتێك بەناو زەوی دووبارە زیندووبوونەوەدا بکەین.

با بڕۆین بۆ ناو ڕەز و باخ و بێستان و دۆڵ و نشێوی سەوز پۆش و بۆ ناو باخچەی گوڵان.

با دەست لە خاکی سەرلەنوێ زیندووبوونەوە بدەین.

با تەماشای ئەم هەموو جوانییە بکەین کە تاکو پێش چەند هەفتەیەکیش مردوو و بێگیان و پووکاوە بوون.

با لەسەر چیمەنی فەرشئاسای بۆنخۆش ڕاکشێین و گوێ بۆ دەنگی ناوازەی جۆرەها مێرووی سەر پەلی درەختەکان ڕادێرین.

با بکەوینە شوێن ڕەوتی خاڵخاڵۆکە گچکەکان.



چاو لە کاروانی مێرووڵەکان بکەین، بنواڕینە کار و خەباتی بێوچانی مێشهەنگەکان و تەماشای دیمەنی سەرسوڕهێنی تەنینەوەی تۆڕی جاڵجاڵۆکەیەك بکەین...

با وشکبوونەوەی باڵی ناسکی پەپوولە تازە دەرچووەکان لەژێر تیشکی خۆردا ببینین.

بۆنی گوڵەباخ و نێرگز و ڕیحانە و گوڵە بەیبون بکەین و ناخمان ئەفسوناوی بکەین.

با دووبارە و سێبارە بەدەم خوێندنەوەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزەوە تەماشای زیندووبوونەوەی پەلی مردوو و لقی وشك هەڵگەڕاوی درەختەکان بکەین و گوێ بۆ دەنگ و سەدای دڵڕفێنی



باڵندە و مێرووەکان هەڵخەین کە بەدرێژایی زستان بێبەش بووین لێـی و لە زیندووبوونەوەی بەهاری پاش دواهەمین ڕۆژی زستان تێبفکرێین:

(جا بڕوانـە بۆ نیشـانە و قـازانجی ڕەحمـەتی خـوا چۆن زەوی بـەو بارانـە زینـدوو ئەکاتـەوە و پاشـان وشـك بوونـەوە و مردنـی. بەڕاسـتی ئـەو خوایـە کـەوا زەوی بـەوجۆرە زینـدوو ئەکاتـەوە، ئـەو خوایە کە مردووان زیندوو ئەکاتەوە و، ئەو خوایە دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکا ئەشکێ.) الروم: ٥٠.

## ئەمە یەکەم زیندووبوونەوەمان نییە!

تۆ تەمەنت دە ساڵە، وانییە؟

پرسیارێك: باشە بەر لە دوازدە ساڵ لەکوێ بوویت؟

ئایا نەبوو بوویت؟

بەڕای من هەبوویت، بەڵام خۆت بیرت نایەت، هەبوویت وەلێ نە بەم شێوەیەی ئێستا.

هەریەك لەو ئەتۆم و پرۆتین و ڤیتامینانەی جەستەتیان پێکهێناوە، لە ژمارەیەکی بێشومار شوێنی جیاجیا بوون.

هەندێکیان لە توێکڵی سێوێکدا، هەندێ لە قاشە پرتەقاڵێکدا، ژمارەیەك لە دەنکە زەیتوونێکدا و هەندێکی دیکە لە گوڵە گەنمێکدا بوون.

چەند ماددەیەك لە هێلکەی مریشکێکدا و چەندی دیکە لەناو مریشکەکە خۆیدا.

بیبەری توون، شانەی هەنگ و هەنگوین، بگرە شیلەی ئەو گوڵانەی هەنگ دەیانمژێت و پاشان هەنگوینی لێ دروست دەکات، چەند سەرچاوە عەمبارێکی پێکهاتەکانی جەستەی تۆبوون.

بەشێکی لەناو هەوادا دەفڕی و بەشێکی دیکەی لەگەڵ دڵۆپەی باراندا دەڕژایە سەر زەوی.

بەم جۆرە، دوازدە ساڵ پێش ئێستا گەردیلەکانی لەشت لە کۆمەڵێکی زۆر و زەبەند و شوێنی جیاواز و نامۆدا بوون.

دواتر بەشێکیان لە جەستەی باوکتدا و بەشێکی دیکە لە جەستەی دایکتدا کۆبوونەوە.

دەرئەنجامی کارلێك و پاڵفتەکردنی هەموو ئەو پرۆتین و ڤیتامین و چەوریانەی جەستەی دایکت هێلکە دروست بوو و لە جەستەی باوکیشتدا سپێرم. بۆ پێکهێنانی ئەم دووانە، لە چەندەها شوێنی دونیاوە ملیاران گەردیلەی جیاواز کۆبوونەوە.

خانە سەرەتاییەکان، دوو کەرت بوون، دابەشبوون و زیادیان کرد، شێوەیان گۆڕا.

بەفەرمان و مۆڵەتی پەروەردگار، هەندێکیان بوونە چاو، هەندێك بە زمان و لووت... دڵ، گورچیلە، دەست و پێ، قۆڵ و ئەندامەکانی دیکە.

تا کاتی لەدایکبوونیشت پرۆتین و کانزا و چەوری و ڤیتامین بەردەوام لە شوێنی جیاوازەوە دەهاتنە لەشی دایەوە و خڕدەبوونەوە تاکو جەستەی تۆ دروست بکەن.

هەندێك لە شوکولات و نەستەلەیەکەوە، هەندێك لە دەنکە گێلاسێکەوە، هەندێکی دیکە لە پارچە شیرینییەکەوە دەهاتن.

پاشان لەدایك بوویت. گریان و نووکە نووکی کاتی لەدایکبوونت دڵی دایە و بابەی پڕکرد لە خۆشی و شادی.

بە تێپەڕینی کات گەورەبوویت.. ڕۆژێك لە ڕۆژان مردیت و ماڵئاواییت لە دونیا کرد، ئیدی ئەوکات جەستەت تێکەڵی گڵ بوو.

گەرد و گەردیلە و نیترۆن و پرۆتۆنەکانی جەستەت، دووبارە دەچن بۆ چەندین شوێنی جیاوازی پێشبینی نەکراو.

هەندێك دەچێتە قەدی درەختێکەوە، هەندێکی تر ڕەشەبا لەگەڵ خۆی دەیبات و دەڕوات.

## گەلۆ کامیان ئاسانترە؟

ئایا جێبەجێکردنی کارێك بۆ یەکەمجار ئاسانترە یان بۆ جاری دووەم؟

بۆ نموونە: مامۆستا داوای نووسینی داڕشتنی لێ کردن. تۆش لە دەستت دەرچوو ئاوت ڕشت بەسەر پەڕەی داڕشتنەکەدا. ئایا دووبارە نووسینەوەی داڕشتنەکە هێندەی یەکەمجاری قورس دەبێت بۆت؟

بێگومان نەخێر!

چونکە ڕستە نووسراوەکانت کەم تا زۆر وەبیردێتەوە و دووبارە نووسینەوەی هەمان ئەو دەستەواژانەی پێشتر نووسیبونت، ئاسانتر دەبێت و هێندەی یەکەمجار قورس نابێت.

نیگارکێشێکیش تابلۆیەك دروست بکات، لەڕووداوێکدا تابلۆکەی بسووتێت و لەناوبچێت گەر وێنەکێشەکە بڵێت: "من دووبارە تابلۆکە

دەکێشمەوە" تۆ ناتوانیت بڵێیت: "ئەدی چۆن! چۆن دەتوانیت دووبارە دروستی بکەیتەوە؟ تازە ئەو بوو بە خۆڵەمێش و با بردی"..

چونکە ئەگەر یەکەمجار توانیبێتی بیکێشیت ئەوا جاری دووەم زۆر ئاسانتر دەتوانێت بیکێشێتەوە!

خودای باڵادەست سەرەتا تۆی لە نەبوونەوە هێناوەتە بوون، گەردیلەکانی هەریەك لە ئاو، هەوا، خۆڵ، ڕووەك و هەر گیاندار و بێگیانێکی دیکە خواردبێتمان کۆی کردەوە و هێنایەوە یەك.

بێشك نابێت بیرمان بچێت، دەستەواژەی قورس و ئاسان بۆ خودا بوونی نییە، وەلیّ لەپێناو باشتر تێگەیشتن لە زیندووبوونەوەی دوای مردن دەتوانین بڵێین: "خودایەك کە لە نەبوونەوە تۆی هێناوەتە بوون، بێگومان گەر ویستی هەبێت دەتوانێت دوای مردن زیندووت بکاتەوە. ئەم کارە بۆ توانستی ئەو زۆر ئاسانتر و ساکارترە لە بەدیهێنانی یەکەمجارت."

بیر لە مرۆڤەکانی یەك دوو سەدە پێشتر بکەرەوە، ئێستا هیچیان نەماون. هەموو بوونەتە خۆڵ، پێکهاتەکانی جەستەیان ئاوێتەی خاك و خۆڵی زەوی بوون.

وەك هەر گیاندارێکی دیکە، ئێمەش کاتێك دەمرین، ئەوکات گەردیلەکانی جەستەمان با تێکەڵی خاك و ئاو و هەواش بووبن، یا چووبێتنە پێکهاتەی ڕووەك و گیانلەبەرانەوە یاخود بە هەر چوارلای جیهاندا بڵاوبووبێتنەوە، ئافرێنەرێك یەکەمجار لە چەندین شوێنەوە

هێنابێته یەك و بەدیهێنابێتین، گومانی تێدا نییە جاری دووەمیش بەدیماندەهێنێتەوە !

هاوشێوەی دووبارە زیندووکردنەوەی هەزاران گوڵی مردوو لە وەرزی بەهاردا، وەك ژیانەوەی پەلی وشك هەڵگەڕاوی ملیۆنان درەخت و چرۆکردن و گەڵاکردن و میوەگرتنیان.

هاوشێوەی ژیانبەخشین بە تۆوی متبووی ژێر خاك لە ڕۆژێکی وەرزی بەهاردا...



# کێ ئێسك و پرووسکی بڕسکاو
# زیندوو دەکاتەوە؟

ساڵانی سەرەتای هاتنی ئیسلام بوو، سەرسەختترین بێباوەڕانی مەککە کۆبووبوونەوە و دەئاخاوتن. لەنێویاندا (ئوبەی کوڕی خەلەف)یش هەبوو کە یەکێك بوو لەو بێباوەڕانەی دژایەتی پێغەمبەری دەکرد و هەوڵی دەدا بەرپەرچی بداتەوە.

ئەو وتی: "محمد دەڵێت بێشك خودا مرۆڤ زیندوو دەکاتەوە، سوێند بە لات و عوززا دەچمە لای و مشتومڕی لەگەڵ دەکەم و دەیبەزێنم" ، پارچە ئێسکێکی ڕزیوی هەلگرت و چووە لای پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ.

"ئەی محمد! کەوایە تۆ دەڵێیت خودا دوای ڕزانی ئەم ئێسقانە زیندوو دەکاتەوە، وانیە؟".

پێغەمبەر ﷺ لە وەڵامدا فەرمووی:

"بەڵێ من وا دەڵێم".

ئوبەی دەم و لووتی دا بەیەکدا و دووبارە وتی:

"یانی تۆ دەڵێیت دوای ڕزینی، خودا ئەم ئێسکە زیندوودەکاتەوە ! ؟".

پارچە ئێسقانەکەی بەدەست ورد کردو تۆزەکەشی بە ڕووی پێشەواماندا هەوادا و وتی:

"ئەی محمد ئایا دوای پتورکانی ئەمە، کێ زیندووی دەکاتەوە ؟ ئێمە دوای ئەوەی دەمرین و ئێسکەکانمان دەڕزن، ئایا زیندوو دەکرێنەوە ؟ کاتێک ئێمەش وامان لێدێت کێیە ئەوەی دەتوانێت زیندوومان بکاتەوە ؟".

لە وەڵامدا پێغەمبەرﷺ فەرمووی:

"بەڵێ خودا گیانت دەکێشێت، پاشان زیندووت دەکاتەوە و دواتریش دەتخاتە دۆزەخەوە".

بەم بۆنەیەوە خودای پەروەردگار ئەم ئایەتانەی بۆ پەیامنێرەکەی ڕەوانەکرد:

**(ئایا ئادەمزاد نازانێ ئێمە ئەومان لە تۆمێ دروست کردووە لە پیاوەوە ئەگاتە منداڵدانی ئافرەت، کەچی کە پێگەیشت ئەبێ بە دوژمنێکی دیار و ئاشکرا؟ کابرای خوانەناس ئێسقانێکی ڕزیوی بە نموونە بۆ هێناینەوە کە گوایە مردوو زیندوو ناکرێتەوە و دروستکردنی خۆیی لەیادچوو کە چۆن لە دڵۆپێ ئاو دروستمان**

کـردووه. وتـی: کـێ ئێسـقانی ڕزیـو زینـدوو ئەکاتـەوە؟ مەبەسـتی ئەوەبوو کەس ناتوانێ زیندووی بکاتەوە. تۆیش، ئەی موحەممەد، لـە وەڵامیـا بڵـێ: ئـەو کەسـە زینـدووی ئەکاتـەوە کـە یەکـەمجار دروسـتی کـردووە کـە خوایـەو ئاگـای لـە هـەموو شـتێکیش هەیـەو، ئەزانێ مرۆ کە مرد چیی لێ دێو، کە ڕزیی خۆڵەکەی ئـەبێ بەچیو ئەکەوێتـە کـوێو چـۆن کۆئەکرێتـەوەو ئەخرێتـەوە پـاڵ یـەك و، بنیادەمەکەی جارانی لێ دروست ئەکرێتەوە.) یس: ٧٧-٧٩.

## کاتێك دووەم فووکرا بە صووردا...

وابزانم بابەتێك ئاوەزتی سـەرقاڵ کـردووە. ڕاسـتر بڵـێم سـەرقاڵی نەکردووی بەڵکو داوای نموونەیەکی وەها لە مـن دەکـەی کـە هـەر بـە بیستنی بڵێیت: "ئێستا تەواوە، ئێستا تەواوە، تێگەیشتم".

بەرلەوەی هەستم بە باسی ئەم بابەتە بـۆ تـۆ، خـۆم پـەرتووکێکم لەوبارەیەوە خوێندەوە، لەوێدا نموونەگەلێکی وا هەبوون، کە هـەر بـە بیستنی، هەموو خاوەن ژیرییەك بڵێت: "ئێستا تەواوە و تێگەیشتم".

وەك پێشـتریش وتبـووم، خـودا فریشـتەیەکی هەیـە بـەناوی ئیسـرافیلەوە، کـە ئیسـرافیل یەکـەم فـووی کـرد بـە صـووردا ڕۆژی قیامەت دەست پێدەکات.

( جا کاتێ کە یەك فوو پیاکردن فووکرا بە (صوور)دا، زەوی و شاخەکانیش لە جێی خۆیان هەڵگیران و بەیەك جار دران بەیەکا،

لەو ڕۆژەدا ئەوەی ڕووئەدا، ڕووئەداو، ڕۆژی قیامەت بەرپا ئەبێ) الحاقة: ١٣-١٦.

هەر کە دووەم فووکرا بە صووردا ئیدی مردووەکان زیندوو دەبنەوە، ئەم کارەش لە ساتێکی کورتدا ڕوودەدات.

(فوویش ئەکرێ بە (صوور) داو، ئیتر کوتووپڕ ئەوان لە گۆڕەکانیان دەرئەچن و بەهەڵەداوان ئەچن بۆ لای خوای خۆیان، بۆ مەیدانی لێپرسینەوە) یس: ٥١.

(لەبەر ئەوەیشە کە ڕۆژی قیامەت بەڕاستی دێ و، خوا بەڕاستی هەموو ئەو مردووانەی لە گۆڕدان زیندوویان ئەکاتەوە). الحج: ٧.

(پاش مردنیش لە ڕۆژی قیامەتا زیندووئەکرێنەوە بۆ حیساب و کیتاب لەگەڵ کردن و لێپرسینەوەی چاکەو خراپەتان). المؤمنون: ١٦.

ئەوەنــدەی ســەرنجم دابێــت، نموونەگــەلێك لــە قورئــان و فەرموودەكانەوە دەربارەی بەهاری ژیاندنەوەی دوای مردن، مێشك و دڵتی دڵنیاكردبێتەوە لە ڕوودانی بەهاری قیامەتی بەڵێندراوی خـودا و چۆنێتی زیندووبوونەوەی دانەدانەی بەدیهاتووان.

شتێكی دیكەش كە سەرقاڵی كردوویت پرسی ئەوەیە: ئایا چۆن ڕۆحی ئەو هەموو مرۆڤە هەر لەسەردەمی باوكە ئادەممانەوە تاكو ئێستا لە یەك كاتدا دەگەڕێنەوە بۆ ناو جەستەی دووبارە زیندووكراوەیان.

واتە ئەم كارە لەگەڵ فووكردن بە صووردا چۆن دەستبەجێ جێبەجێ دەكرێت.

بۆ نموونە: سوپایەكی زۆر گەورە هەیە لە هەزاران سەرباز پێكدێت. پاش ڕۆژێكی دوورودرێژ لە ڕاهێنان و مەشق كردن، زەنگی سوپا لێدەدرێت و فەرماندەی گشتی بانگەواز دەكات و فەرمان دەدات.



"بڵاوە بکەن و پشوو بدەن".

تەواوی سەربازەکان هەریەکە و بەلایەکدا بڵاوەیان لێکرد، یەکێك چووە ژێر سێبەری درەختێك و حەوایەوە، یەکێکی دیکە بەلایەکی تردا چوو... دوای ماوەیەك لە پشوودان، فەرماندەی سوپا لە بڵندگۆکەوە فەرمانی دووبارە "گردبوونەوە"ی دا.

سەربازەکان دەنگی بڵندگۆکەیان بیست و لە هەرکوێیەك بن بەبێ دوودڵی و دەستبەجێ گوێڕایەڵی فەرمانەکانی دەکەن، بێ جیاوازی هەموویان دەچنە سەر چەکەکانیان و ڕیز دەبەستن.

هاوشێوەی ئەمە، هەر کە کاتی زیندووبوونەوە هات، خودای باڵا فەرمان بە فریشتە ئیسرافیل دەکات فوو بکات بە صووردا. کە زەنگی صوور لێدرا گشت ڕۆحەکان گوێ دەدەنە دەنگەکەی.

هەر ڕۆحێك بەبێ ئەملاولا دەچێتەوە ناو جەستەی خۆی.

لەبەرئەوەی فەرمانەکە فەرمانی خودایە جێبەجێ کردنیشی بێ قرەوبڕەیە. فەرماندەیەکی سوپا کە مرۆڤێکە ئەگەر لە بڵندگۆیەکەوە بتوانێت بەیەك بانگەواز تەواوی سەربازانی کۆبکاتەوە، بێشك و بەوپەڕی ئاسانی خودای باڵادەست لەڕێگەی فووکردن بە صووردا فەرمان دەکات بە گردبوونەوەی تەواوی مرۆڤ و بەدیهاتوانی دیکە.

نموونەیەکی دیکە: شارێك بهێنە بەرچاوی خۆت، شارێکی مەزن.

دەکرێت کارەبای هەموو شار لەناوەندێکەوە دابەش بکرێت... بە داخستنی تەنیا یەك دانە سویچ پلاکی ئەم ناوەندە کارەبای هەموو شار دەبڕێت، بەپێچەوانەشەوە، بە هەڵکردنی کارەبای شار دێتەوە. واتە بە ملیۆنان گڵۆپی شارەکە لەهەمان کاتدا دەکوژێنرێنەوە و هەڵدەکرێن... تەنانەت گەر بمانەوێت دەکرێت گڵۆپی هەموو جیهان پێکەوە ببەسترێنەوە و وزەکەشیان لە تەنیا ناوەندێکەوە کۆنترۆڵ بکرێت. ئەویش لە یەك کاتدا و بە یەك جووڵەی ساکار...

ئێستا بەوپەڕی دڵنیایی و ئاسانی دەتوانین بڵێین: خودایەك کە بەدیهێنەری هەموو شتێکە بەکارەباشەوە: بە تەنها فەرمانێکی هەرچی جەستەی مردوو هەیە دووبارە دەژێتەوە و لەگەڵ ڕۆحەکاندا پێك شاد دەبنەوە. ئەویش لە هەمان کاتدا...

# ئایا ڕۆژیی دوایی چۆن جیهانێکە؟

دەنکە تۆوێك کە دەکەوێتە ناو زەویەوە، کاتێك لەگەڵ هاتنی بەهاردا سەوز دەبێت، هاوکات ئەو باخچەیەی تۆوەکەی تێکەوتووە لەگەڵ تۆوەکەدا سەوز دەبێت. مرۆڤیش کە دوای مردنی زیندوو دەکرێتەوە، ئیدی لەو باخچە و شوێنە نابێت کە پێشتر لێی بووە.

نە ماڵی ماوە، نە ئەو شارانەی ئاشنابوون پێیان، نە وڵاتان و جیهان... نە ئاسمانی بەرین بەسەریەوە ماوە، نە ئەستێرە گەشەکانی...

بەڵکو ئێرە، جیهانێکی نوێ و تەواو جیاوازە، پێی دەڵێن: ئەو دونیا یاخود ڕۆژی دوایی.

مەزنترین جیاوازی جیهانی ڕۆژی دوایی و ئەم جیهانەی ئێستا، جاویدانێتی جیهانی ڕۆژی دواییە.

لەسەروبەندی نووسینی ئەم ڕستانەدا جۆرێك لە نامۆیی ناخمی داگیر کرد، دەڵێی ڕێبوارێکم و بۆ مەملەکەتێکی دیکە دەچم و ڕێگەم ون کردووە، هەستێکی نامۆ سەرودڵی گرتم.

ئایا من چ بکەم لەو دونیا کە هیچ ئاشنایەتییەکم لەگەڵیدا نییە؟
ئایا لەوێ چیم بەسەر دێت؟ بەم جۆرە ئاهم هەڵدەکێشا و خۆم لە خۆمم دەپرسی.

ئاخۆ تۆش لەگەڵ مندا هەمان هەستت بۆ دروست بوو؟

وەلێ پاشان بیرم کردەوە لەوکاتەی سەرەتا چاوم بەم دونیایە هەڵهێنابوو. ئەو کاتەی بۆ یەکەمجار پێمنایە سەر خاکەکەی و هەواکەیم هەڵمژی، ئەم دونیایەم چەند لەلا نامۆبوو و خۆیشم چەند لاوازبووم!

ڕێك وەك منداڵێك بووم کە بە تەنیا بکەوێتە دارستانە نهێنی و چڕوپڕەکانی ئەفریقاوە.

هیچ شتێکم نەدەزانی.

کەسم نەدەناسی.

لەوانەبوو لەبن هەر درەختێك و هەر کون و قوشبنێك و ناو هەر قوتویەکدا، جانەوەرێك خۆی بۆ مەڵاس دابووم و لەسەر پێ بوویێت بۆ پەلاماردانم. لەگەڵ ئەوەشدا من توانای ئەوەم نەبوو کە خۆم لە دەمی هەموو ئەو جانەوەرانە قوتار بکەم.

بەڵام ئاشکرایە من بەتەنیا نەهاتبوومە ئەم دونیاوە. خودایەك کە پێش لەدایکبوونم سکی دایکمی بۆ کردبووم بە مەنزڵێکی ئەوپەڕی ئارام و بەرین، کاتێکیش چاوم بەدونیا هەڵهێنا، دایکێکی بەسۆز و میهرەبانی لە ژوور سەرمدا بۆ ئامادە کردبووم.

هەرچەندە نەمدەزانی برسیبوون مانای چییە، بەڵام لەکاتی برسێتیدا شیرێکی پاك و بێگەرد لە سینەی نەرمونیانترین مرۆڤی دونیاوە بۆم هەڵدەقوڵی.

نەمدەتوانی بەرێدا بڕۆم، وەلێ پیاو و ژنی گەورە گەورەی چواردەورم، هێندەیان خۆشدەویستم کە هەر دڵیشیان نەدەهات لە باوەشیان دامگرن، واتە پێم بەر زەوی نەدەکەوت.

هەوایەکی پاکژ ئامادەباش بوو تاکو لە لووتمەوە بچێتە ژوورەوە و کەیف و خۆشی ببەخشێتە سیەکانم.

نەمدەزانی ئاو چییە، وەلێ تینووم دەبوو، لە هەر چوارلاوە ئاوی سازگار هەڵدەقوڵی و تێر تێرم دەخواردەوە.

کاتێك گەورەبووم باشتر تێگەیشتم لەوەی خودای جیهانیان چەندە میهرەبان و باش چاودێری کردووم.

بەڕاسەرمەوە گلۆپێکی مەزن هەبوو، هەم ڕووناکی دەبەخشی و هەم گەرم ڕایدەگرتم. شەوان تاریك بوو، وەلێ ڕووناکی مانگ و ئەستێرەکانی ئاسمان دەدرەوشایەوە.



ئای خوایە، چەند شتگەلێکی زۆر لەم دونیایەدا بۆ من فەراهەم کرابوو. مێشی ژەهراوی هەنگوینی بۆ دروست دەکردم، گوانی مانگای زەبەلاح بۆم بووبوو بە کانی شیرێکی سپی بەتام.

خۆشترین میوەکانم خوارد... بۆنخۆشترین گوڵم بۆن کرد... ئای، ڕەنگیان چەند جوان بوو...

کەواتە ئەو خودایەی ناردبوومیە ئەم دونیا، منی زۆر خۆشدەویست چەند میهرەبان و دەست کراوە بوو بۆم، بەوپێیەی ئەم هەموو خوانەی دەخستە بەردەمم، دەبێ خەزێنەی داراییەکانی گەلێك مەزن و دوایی نەهاتبوو بێت.

چەند بەسۆز و توانا بێت...

خودایەك لەم دونیا هێندە میهرەبان و بەخشندە بووبێت، کاتێك دەمنێرێت بۆ دونیایەکی دیکە، بۆچی دەبێت لەخۆڕا هەست بە نامۆیی بکەم.

چونکە من ڕێبوارێکی بیابانی ڕێ ونکردوو نیم، بەڵکو لە یەکێك لە جیهانەکانی خودای خۆمدام.

هەروەك چۆن جیهان شوێنی ئەوە، ئەو دونیاش هەروەها.

منیش یەکێك بووم لە بەندە لاواز و بێدەسەلاتەکانی کە بەوپەڕی هەستیارییەوە بەخێوی کردن، نان و ئاوی پێدان و گەورەی کردن.

کردگاری خۆمم زۆر خۆشدەویست. جیا لەمە. ئایا بۆچی دەبێت ئێستا میهر و سۆزی خۆیم لێ ببڕێت لەکاتێکدا هەتا ئێستا هەردەم سایەی سەرم بووە؟

من زاتی ئەوم وەها ناسی و باوەڕم پێکرد.

ئەدی خۆی نافەرموێت: "بەندەکانم چۆن بمناسن و گومانم پێ ببەن، من بەم جۆرە دەبم لەگەڵیاندا".

## گۆڕەپانە مەزنەکەی مەحشەر

لەگەڵ فووکردنی فریشتەی ئیسرافیل بە صووردا، تەواوی مرۆڤایەتی هەر لە باوکە ئادەمەوە زیندوو دەبنەوە و پێکڕا بەرەو گۆڕەپانێك دەچن کە پێی دەڵێن: گۆڕەپانی مەحشەر.

ئەمە ئەو شوێنەیە کە دەچینە بەردەم دەرگانەی زاتی ئافرێن.

ڕووخساری بەشێك لە مرۆڤەکان دەدرەوشێتەوە. لەو دەمەدا ئەوان دەڵێن: "بەڵێ، ئەو ڕۆژە مەزنەی خودا لەدونیادا بەڵێنی دابوو ئەوە هات! خۆ ئێمە هەر دڵنیابووین لەوەی دووبارە زیندوو دەبینەوە، ئەو خودایەی تەنانەت تۆوێکی ژێر زەوی لەبیر ناکات هەرگیز ئێمەش لەبیر ناکات" و خۆشی شادبوونەوەیان بەخودای خۆیان دەردەبڕن.

مژدەبێت بۆ ئەوان! ئیدی بە بەدیهێنەریان گەیشتنەوە! بە خۆشەویستانیان شادبوونەوە! ڕۆژانێکی پڕ لە خۆشی و شادی نەبڕاوە چاوەڕوانیانە! بەپشتیوانی خودا ئێمەش یەکێك دەبین لەوان...

بەپێچەوانەوە ڕووخساری هەندێکی دیکە ڕەش دادەگەڕێت.

هاوار دەکەن و دەناڵێنن: "ئەی هاوار! کێ ئێمەی لە گۆڕەکانمان دەرهێنا؟".

هێندەی پێناچێت ڕاستی ڕووداوەکانیان بۆ دەردەکەوێت، بە پەشیمانی و ترسەوە دەڵێن: "ئەمە ئەو ڕووداوە بوو خودا بەڵێنی دابوو، کەوایە پێغەمبەران ڕاستیان گوتووە".

ئەمە ئەوانەن کە لە دونیادا باوەڕیان بەخودای تاقانە و هاتنی ڕۆژی دوایی نەبوو.



بەهۆی باوەڕنەبوونیان بە لێپرسینەوەی دوای مردن، خراپە نەمابوو نەیکەن!

بەوپەڕی هەستی پەشیمانییەوە "خۆزگە" دەخوازن و دەڵێن:

"خۆزگە ئێمەش ژێر بووینایە و باوەڕمان بە خودای تاقانە بهێنایە. گوێڕایەڵی پێغەمبەران بووینایە.

کاری خراپمان ئەنجام نەدایە و ستەممان لەوانی دیکە نەکردایە. ئامادەکاریمان بۆ ئەم ڕۆژە بکردایە و گاڵتەو گەپمان بە خەڵك نەکردایە.

خاك بەسەرمان! تازە پێمان تێچەقیوە و خەسارۆمەندبووین!.

وەلێ مەخابن، پەشیمانی دوای کارلەکارترازان بەکەڵکی هیچ نایەت، چونکە دوای ئەو دەرفەتەی خرابوژە بەردەممان بۆ چاکەکاری ئیدی بەکۆتا گەیشتووە، ئیدی ژیانی دونیا کۆتایی هاتووە.

واتە تاقیکردنەوەکە تەواو بووە، ئیدی نۆرەی ئاشکرابوونی براوە و دۆڕاوەکانە.

# له مەحشەر چی ڕوودەدات؟

هەموو کردەوەکانی ئەم دونیایەمان تۆمار دەکرێن. هیچ شتێك بە هەدەر ناچێت، هیچ کارێك لەبیر ناکرێت.

کاتێك گرۆی مرۆ لە مەیدانی لێپرسینەوەدا کۆدەبنەوە، دەفتەرێك دەدرێت بەدەست هەر یەکێکیانەوە، تەواوی سەرگوزەشتەی ژیانمان بێ کەم و زیاد لەو پەڕاوەدا نووسراوە.

بێگومان ئێستا نازانین چۆن دەفتەرێکە کە تەواوی کردەوە و گفتارەکانمانی بە وردەکاریەوە تێدا تۆمارکراوە. بەڵام خۆ شتێکیش نییە کە نەتوانین درکی پێ بکەین.

چونکە بەدیهێنەر لەسەر ڕووی زەوی چەندین ڕێگای هەمەجۆری نووسین و تۆمارکردنی وەهای بەدیهێناوە کە مرۆڤێك شارەزایی ئەوان بێت ئیدی پێویستی بەوە نییە بپرسێت: "گەلۆ هەموو ژیانی من چۆن تۆمار دەکرێت؟".

بۆ نموونە: لەپەڕەکانی دەنکەتۆوێکی گچکەدا تایبەتمەندییەکانی درەختێکی زەبەلاح هەر لە ڕەگەوە تا گەڵاکەی و پەل و قەد و گوڵ و شێوە و ڕەنگ و تام و بۆنی بەرەکەی... هتد نووسراوە.

شریتی DNAی ناوکی خانەکانی جەستەمان لە گەورەوە بۆ بچووک ملیۆنان تایبەتمەندیمانی تێدا نووسراوە. ئەم شریتی DNAیە هێندە بچووکە کە تەنانەت بە میکرۆسکۆبی ئەلکترۆنیش ئەستەم دەبینرێت.

ناوەندی تۆمار لە مێشکدا کە جێگایەکی زۆر کەمی داگیر کردووە، هەرچی یادەوەری ژیانی ڕۆژانەیە تێیدا عەمبار دەکرێت. ناو و شێوە و کردار و گوفتاری هەموو ئەو کەسانەی تێدا دەنووسرێتەوە کە ئاشنایان بووین.

ئەو زانیاریانەی لە قوتابخانە فێردەبین، ئەو شمەکانەی لە چواردەورماندا دەیبینین، ئەو بۆنە جیاوازانەی لووتمان بۆنیان دەکات... هتد، هەموو ئەمانە لە "یادگیر"ە گچکەکەی مێشکدا، هێندەی دەنکە نیسکێك دەبێت، تۆمار دەکرێت.

پاش ئەم نموونانە، ئیدی تێگەیشتن لە تۆماری سات بەساتی ژیانمان نابێت کارێکی قورس بێت.

تاکو پەنجا ساڵ لەمەوپێشیش کە باسی نووسین و تۆمارکردن دەکرا، دەستبەجێ ڕیزکردنی پیت و وشە و ڕستە یەك بەدوای یەکدا دەهات بە خەیاڵماندا، وەلێ مرۆڤ دواتر ڕێگا و شێوازی تەواو جیاوازی نووسین و تۆماری دۆزیەوە.



بۆ نموونە: سەرەتا فێربووین دەنگ لەسەر کاسێت تۆمار بکەین، پاشان دیمەن و فیلم لەسەر کاسێتی ڤیدۆیی.

لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا هۆکاری جیاوازتر هەیە: وەك سی دی، دی ڤی دی، میمۆری...

ئەمڕۆ هەموو کەسێك بە ئاسانی دەتوانێت ئەم کەرەستانە بەکاربهێنێت. زانیاریی و یادەوەری گەلێك کە بە چەندین ساڵ و لەسەر پەڕەی چەندین هەزار پەڕاو نووسینەوەیمان بۆ تەواو ناکرێت، ئێستا ئیدی بەوپەڕی ئاسانی لە میمۆریەکی هێندەی لەپی دەستدا دەتوانین تۆماری بکەین.

واتە لەم سەردەمەدا ئیدی کاتێك باسی نووسین و تۆمار دەکرێت، شتگەلێکی جیاواز لە پەڕە و پێنووس و تیانووسمان دێتـە بەرچاو... ئەمانە کۆمەڵە شتێکن ئەگەر پێش چەند ساڵێك باسبکرایە باوەڕمان نەدەکرد.

با ئیتر (پەڕاوی کردەوە)کانمان کە لە ڕۆژی دواییدا دەدرێتە دەستمان بخەینە لایەکەوە بگەڕێینەوە بۆلای خودی ڕۆژە مەزنەکە (ڕۆژی دوایی).

## تەنانەت بچووکترین چاکەش

کاتێك نامەی کردەوەکانمان دەدرێتە دەست، سەرمان سوڕدەمێنێت. هەندێك لە خۆشیا و هەندێکی دیکە لە ترسا سەریان سوڕدەمێنێت.

ئەوانەی سەرسوڕماوی کەیف خۆشن، دەبینن تەنانەت بچووکترین چاکەشیان تۆمارکراوە.

بگرە ئەو چاکەکاریانەی چواردەورەکەت نایبینن و نایبیستن و دەستخۆشی ناکەن...

نەك تەنیا ئەمە: بەڵکو ئەو چاکانەی نیەتی کردنمان بووە و نەمانتوانیوە بەجێی بهێنین، ئەوانەشمان بۆ نووسراوە.



ئەو دەمە بە سەرسوڕمانێکەوە دەڵێین: "ئای خوایە، باشە من نیەتم بوو ئەم چاکەیە بکەم وەلێ بۆم نەکرا، کەچی ئێستا ئەوەیشم بۆ نووسراوە".

جار نا جار پارمەتی کەسێکی دیکە دەدەین لە ئەنجامدانی کارێکی باشدا، پاداشتی ئەو چاکەیە بەهەمان شێوەی بکەرەکەی بۆ ئێمەی یاریدەدەریش دەنووسرێت. ئیدی سەرسوڕمانێکی پڕکەیف و خۆشی دەمانگرێت.

جیا لەمە ناڕەحەتی و چەرمەسەریەکانی دونیاش لە پەڕاوەکەماندا تۆمار دەکرێن. بۆ نموونە: دڕکێك بچەقێت بە قاچماندا، ئازارەکەی لە دەفتەرەکەماندا دەنووسرێت. گرنگ تۆمارکردنی ئەم

ئازارە کەمە نییە، بەڵکو ئەوەی بایەخدارە ئەوەیە کە ئەم ئازارە کەمە بۆتە هۆی سڕینەوەی تاوانێکمان.

کەسانێك دەبینن پاداشتی چاکەگەلێکیان بۆ نووسراوە کە نە خودی خۆیان کردوویانە نە بوونەتە هۆکاری. ئەمە پاداشتی کاری چاکەی ئەو کەسانەن کە ئەم دوای خۆی بەجێیهێشتوون.

بۆ نموونە: دایك و باوکێك ئەوەی چاکەکار لەدوای خۆی بەجێبهێڵێت، پاداشتی کارچاکی ئەوەکانی لە پەڕاوی کردەوەکانیدا دەبینێتەوە.

کەسێك خێراوێکی گشتی دابنێت، چەند کەس لە ئاوەکەی بخۆنەوە و تینوێتیان بشکێت، هێندە پاداشتی خاوەنەکەی دەدرێتەوە. بگرە نەك تەنیا ئاوخواردنەوەی مرۆڤ، بەڵکو چەندە باڵندە و پشیلە و سەگیش لە ئاوەکەی بخۆنەوە پاداشتی ئەوانیش وەردەگرێت. واتە پەڕاوی کردەوەی چاکەکار لەدوای مردنیشی بەردەوامە لە نووسران، وەلێ تەنیا کارە چاکەکانی.

خاوەنی دەفتەرێکی پڕچاکەی وەها، کردە پەڕاوەکەی دەدرێتە دەستی ڕاستی.

(لەو ڕۆژەدا ئێوە، ئەی ئادەمزاد و پەرییان، پیشان ئەدرێن لە حزووری خوادا هیچ شتێکتان کە شارراوە بێ لەویا ناشاررێتەوە، جا ئەوەی کارنامەکەی بدرێتە دەستی ڕاستی، کارنامەکەی پیشانی خەڵك ئەدا و ئەڵێ: فەرموون کارنامەکەم بخوێننەوە، من

ئەمزانی بە حیساب و کیتابی خۆم ئەگەم و، سوپاس بۆ خوا وا پێیگەیشتم) الحاقة: ١٨-٢٠.

ئەمانە وەك قوتابیەكی سەركەوتوو وان كە لە كۆتایی ساڵدا كارتێكی پڕ لە نمرەی بەرز وەردەگرن و لەخۆشیدا پێیان زەوی ناگرێت، بەوپەڕی شانازییەوە دەیگرن بەدەستیانەوە و پیشانی هاورێیانی دەدەن.

بەبێ بوونی هیچ پەردەیەك، پەروەردگارمان ڕاستەوخۆ ئاخاوتنمان لەگەڵدا دەكات.

زاتی ئەو لێمان دەپرسێت: ئایا لاویێتیت لەچیدا بەسەر برد ماڵ و سامانەكەت لەچیدا خەرج كرد، ئایا ئەو شتە باشانەی فێریان بوویت پەیڕەوت كردووە یاخود نا؟ بەتایبەتیش پرسیاری نوێژمان لێ دەكرێت. ئەوەی لە پرسیاری "نوێژ"دا سەركەوتووبێت، دەرچوونیشی لە پۆل ئاسانتر دەبێت.

سەیرێكی نامەی كردەوەی چاكەكاران دەكرێت، ئەگەر چەند هەڵە و تاوانێكی ئەوتۆی تێدابێت، بەهۆی سەنگینی چاكەكانیانەوە خودای بەڕەحم و بەزەیی بۆیان دەپۆشێت و پیشانی ئەوانی دیكە نادرێت. بەڵام درك بەوە دەكەن كە خودا لێیان خۆشبووە.

بەتایبەت ئەو مرۆڤانەی لە دونیادا نەنگی ئەوانی دی دادەپۆشن، بەبەزەیین لەگەڵ ئادەمی و گیانلەبەر و درەختدا، پشكداری هەرە مەزنی میهرەبانی خودا دەبن.

پرسیار و وەڵام بۆ ئەوان ئاسانتر دەبێت.

ناڕەحەتی ڕۆژی دوایی یان هەر هیچ ناچێژن یاخود بە بەراورد بەوانی دیکە کەمتر دەیچێژن.

(جا هەرکەسێ کتێبی کارنامەی خۆی بدرێتە دەستی ڕاستی، ئەوە لەوەپاش بە ئاسانی لێی ئەپرسرێتەوە و، بە دڵی خۆشەوە ئەگەڕێتەوە بۆ ناو خێزان و کەسوکاری خۆی.) الأنشقاق: ٧-٩.

لەلایەکی دیکەوە کەسانێك هەن دەفتەرەکانیان پڕێتی لە خراپەکاری. ئەمانە نامەی کردەوەکانیان دەدرێتە دەستی چەپیان. ئەمانە ئیدی تووشی سەرسوڕمانێکی پڕ لە ترس و بیم دەبن.

واقیان وڕدەمێنێت چونکە دانەبەدانەی خراپەکاری و ستەم و نادادگەریەکانیان دەبیننەوە.. ترس دایاندەگرێت چونکە ئەو پێغەمبەرانەی بەدرۆیان دەخستنەوە ئەوا ئێستا دەرکەوت کە هەموو وتەکانیان ڕاست بووە، ئەو ڕۆژی لێپرسینەوەیەی باوەڕیان پێی نەهێنا و گاڵتەیان پێدەکرد ئەوا ئێستا ئیدی هاتووە و خۆدزینەوەش لێی مومکین نییە.



(کەسێکیش کارنامەکەی بدرێتە دەستی چەپی، ئەوە بە هۆی ئەنجامشەڕیی خۆیەوە ئەڵێ: خۆزگە کتێبی کارنامەکەم نەدرایەتە دەستم، نەیشمزانییایە حیساب و کیتابم چیە و چۆنە، خۆزگە ئەو مردنە کە مردم مردنێ بووایە وای بمراندمایە هەرگیزاو هەرگیز زیندوو نەبوومایەتەوە، هەرچی پارە و دارایییم هەبوو دادی نەدام و سوودی نەبوو بۆم، سامان و دەسەڵاتم بەسەر خەڵکا، یا ئەو بەڵگانەی لەدنیادا ئەمهێنانەوە بۆ ئیسپات کردنی ڕاو بۆچوونی خۆم، هەموویم لە دەس چوو). الحاقة: ٢٥-٢٩.

# چاکە و خراپە
# چۆن دەکێشرێن؟

لەڕۆژی پەسلاّندا شتێکی دیکە کە ڕووبەڕووی دەبینەوە، تەرازووی دادگەرییە.

(ئێمە ترازووی سەرنەکردوو(پێوانی کردەوەکان) دائەنێین لە ڕۆژی قیامەتا بۆ کێشانەی چاکە و خراپەی خەڵك، ئیتر هیچ کەسێ ستەمی لێ ناکرێ و هەقی خۆی ئەدرێتێ...) الأنبياء: ٤٧.

ئەم تەرازووی دادگەرییە، لە تەرازووی ئاسایی ئەم دونیایە ناچێت کە کاسبکار لە دوکانەکەیدا سەوزە، میوە، گۆشت، ئاڵتون...هتد پێدەکێشێت.

چونکە کالآیەکی زۆر جیاواز دەکێشێت، کالآی چاکە و خراپە.

ئێمە نازانین شکڵ و شێوەی تەرازووی دادگەریی چۆنە، وەلێ کاتێك لە ڕۆژی بەڵێندراودا دیتمان دەستبەجێ دەبێژین: "بەڵێ! ئەمە ئەو تەرازووەیە کە قورئانی پیرۆز باسی کردبوو".

توانای کێشانی چاکە و خراپەی هەیە.

بەهۆی ئەم تایبەتمەندییەوە تێدەگەین بۆچی ئێستا نازانین چۆن تەرازوویەکە. چونکە لە دونیادا تەرازوویەك نییە چاکەی مرۆڤێك بخەیتە تایەکیەوە خراپەکانیشی بخەیتە تایەکەی دیکەی، بتوانێت پێمان بڵێت کامیان سەنگینترن.

چاکە و خراپەی نووسراوی نێو تۆماری کردەوەکانمان دەخرێتە سەر تەرازووەکە و دەکێشرێن. خۆش بەحاڵی ئەوانەی چاکەکانیان لە خراپەکانیان قورسترە!

ئەو تایبەتمەندییەی تەرازووەکە دڵخۆشمان دەکات، ون نەکردنی هیچ چاکەیەکە لە ژیانی دونیادا ئەنجاممان دابێت، بە ئەندازەیەك کە گچکەترین چاکەشمان دەبینینەوە.

بێشك ئەمە تەنیا یەك ڕەهەندی نییە. خراپەی ئەنجامدراویش، بێ گوێدانە گەورەو بچووکی، دەخرێتە تایەکی تەرازووەکەوە.

(... ئەگەر کەسێکیش دانە خەردارەیێ چاکە یا خراپەی هەبێ ئەیهێنینە مەیدانی حیسابەوە و بۆیی حیساب ئەکەین و ئێمە بەسین بۆ حیساب کردنی چاکەو خراپەی بەندە.) الأنبياء: ٤٧.



وەلـێ لێـرەدا بەنـدە سەرڕاسـتەکانی خـودا لـە خۆشـیا سـەریان سـوڕدەمێنێت، هەنـدێکیان ڕووبـەڕووی گـەلێك سـوپرایزی هەمـەجۆر دەبنەوە!

پـەروەردگاری مـەزن زۆر گرنگـی بـە کـردە چـاکەکانمان دەدات. بەجۆرێك چاکەیەکی نووسراوی نێو دەفتـەری کردەوەکانمـان، لەسـەر تەرازووەکە سەنگی دە چاکەی دەبێت. خراپەکانیش هـەروەك خۆیـان دەمێننەوە -بەبێ زیادکردن-.

ئایا بەڕای تۆیش ئەمە مژدەیەکی دڵ ئارامکەرەوە نییە؟

(هەرکـەس چـاکەیێ بکـات دە قـاتی ئـەو چـاکەیە پاداشـی ئەدرێتەوە، هەرکەسیش خراپەیێ بکات تـەنها بـە قـەدەر خراپەکـەی تۆڵەی لێ ئەسەنرێ و، هەرگیز ستەمیان لێ ناکرێ بە کەم کردنەوەی

پاداشی کردەوەی چاك، یا بە زیادکردنی تۆڵەی کردەوەی خراپ.)
الأنعام: ١٦٠.

دەزانم وێڕای خۆشحاڵیت بەشێوازی کێشانی کردەوەکانت لەسەر (تەرازووی دادگەری) بەڵام پرسیارێکیش ئاوەزتی بەگیرهێناوە.

ئایا هۆکاری چیە خودا چاکەکانمان بە دە و خراپەکانمان بە یەك هەژمار دەکات؟

ئەگەر (تەرازووی کردەکێشان) بەدەست تۆ بووایە، چاکە و خراپەشی هەر بە یەك حساب دەکرد، وانییە؟

تەنانەت ڕەنگە لە مێشکی خۆتدا بڵێیت: باشە لەبەرئەوەی خەڵکی خراپەی ئەنجامداوە و زانیویشیەتی خراپە، نابێت سزای خراپەکانیان چەند هێند بێت؟ وانییە؟

گەر بەدەست تۆ بوایە: لەوانەیە لەگەڵ هەر سێ هەڵەیەکدا چاکەیەکیشت بسڕیایەتەوە!...

وەلێ خودای تاقانە "الله" خاوەنی لێبوردەیی و میهرەبانی بێ سنوورە. ئەو زاتە خۆشحاڵە بە چاکەکاری لەگەڵ بەندەکانیدا و پەردەپۆشکردنی تاوانەکانیان.

چەند هێندەی داواکارییەکانت پێدەبەخشێت. لە تاوانەکانت خۆشدەبێت.

ڕێبەری گرۆی بەشەر محمدﷺ بەم شێوەیە باسی میهرەبانی خودامان لە ڕۆژی دواییدا بۆ دەکات:

"بێگومــان خــودا ســەد ڕەحمــەتی هەیــە. یــەك لــە ســەدی ڕەحمەتەکــەی ڕژانــدووە بەســەر مــرۆڤ، جنۆکــە، ئــاژەڵ، ڕووەك و گیانلەبەرانـدا. هــەر لەبەرئەوەیـە ئــەوان بــەزەییان بەیەکدا دێتــەوە و بەرامبــەر یەکـدی سـۆز و میهرەبــانی دەنــوێنن. هــەر بــەم هۆیــەوە دڕندەکان بەزەییان بە بێچووەکانیاندا دێتەوە.

بەڵام پەروەردگار نەوەد و نۆ لە سەدی ڕەحمەتەکەی هەڵگرتووە بۆ ڕۆژی دوایی. لە ڕۆژی پەسڵاندا بەو ڕەحمەتە فراوانـەی میهرەبـانی بەرامبەر بەندەکانی نیشان دەدات".



## ئایا لە ڕۆژی لێپرسینەوەدا پێغەمبەرمان ﷺ هاودەمیمان دەکات؟

ڕۆژێکی پشوو چوومە دەرەوە نەختێك بگەڕێم. ڕۆیشتم، ڕۆیشتم، گەیشتمە لای باخچەی قوتابخانەیەك.

بینیم لە باخچەکەدا ژن و پیاوی گەورە گەورە ڕاوەستابوون. لە بەردەرگایش دەرگاوانەکە.

لێم پرسی:

"ئەو خەڵکە بۆچی لە باخچەی قوتابخانەکەدا ڕاوەستاون؟".

دەرگاوان:

"ئەمڕۆ تاقیکردنەوە هەیە".

"ئای، تاقیکردنەوە هەیە!؟".

"بەڵێ وایە!".

"باشە بەڵام ئەمانە تەمەن گەورەن، ئیدی چ جۆرە ئەزموونێك هەیە؟".

دەرگاوانەکە بە پێکەنینەوە:

"تاقیکردنەوەی خۆیان نا، هی منداڵەکانیان".

"ئەی منداڵان لەکوێن؟".

"دەبێ لەکوێ بن، بێگومان لە پۆلدان".

"کەوایە ئەمانە...".

"ئەمانە دایك و باوکی قوتابیانن".

"بۆچی لێرەن؟".

"لەبەرئەوەی نایانەوێت لەم ڕۆژە گرنگەدا ڕۆڵەکانیان بە تەنیا بەجێ بهێڵن".

"کەوایە لێرەن تاکو منداڵەکانیان تەنیا نەبن!".

"بەڵێ وایە..".

"ئای خوایە! سەرنجڕاکێشە".

"چ بووە؟".

"هیچ...".

بێگومان من لەوە تێگەیشتم چاوەڕوانکەران دایك و باوکی ئەو منداڵانەن کە لە ژوورەوە گیرۆدەی پرسیارەکانی تاقیکردنەوەکەن. وەلێ دڵم خواستی برێك لەگەڵ کاکی دەرگاواندا بدوێم. چونکە بە بینینی باخچەی قوتابخانەکە تابلۆیەکی گەلێك جیاواز هاتە بەرچاوم.

تابلۆی ڕۆژی لێپرسینەوە!

ئەگەر بۆ ئەزموونێکی ئاسایی ئەم دونیایە دایە و بابە تەنیا بەجێمان نەهێڵن و هاودەممان بن، بێشك پێغەمبەری ڕێنیشاندەری دڵسۆزمان لە گەورەترین تاقیکردنەوەی ژیانمان -ڕۆژی دوایی- لە

حزووری خوای پەروەردگاردا هاودەممان دەبێت. تەواو دڵنیابووم لەمە...

چونکە ئەو ئەوپەڕی بەسۆز بوو لەگەڵ ئومەتەکەیدا. زیاد لە میهرەبانی باوکێك میهرەبان بوو لەگەڵماندا و بیری لێ دەکردینەوە.

تووشبوونمان بە هەر کێشەیەك ئەوی زۆر دڵگران دەکرد.

دڵگرانی ئێمە دڵگرانی ئەو بوو...

هیچ کەس هێندەی ئەو بیری لە خۆشگوزەرانیی ئێمە نەدەکردەوە.

لەماوەی پێغەمبەرایەتیدا، تاقە شەوێکی تا بەیان بە خەوەوە بەسەر نەبردووە. شەوان ڕادەبوورد و نزای بۆ هەموو ئومەتی ڕابردوو و داهاتووشی دەکرد. تەنانەت قاچە پیرۆزەکانی دەئاوسان ئەوەندە نوێژی دەکرد، بەچاوی ئەسریناویەوە داوای لێخۆشبوونی لە خودا بۆ ئێمە دەکرد، داوای ڕەحمەت و خۆشگوزەرانی و هەموو شتێکی باشی دیکەی بۆ دەکردین.

یەکێك بوو لە ڕۆژە بۆنخۆشەکانی سەردەمی خۆشگوزەرانی – سەردەمی پێغەمبەرﷺ–، ئەو ڕۆژە پێشەوامان زۆر کەیف خۆش بوو. دایکە عائیشە کە بەو جۆرە دیتی، لێی پرسی:"پێغەمبەری خودا دوعام بۆ بکە".

پێغەمبەر بەم جۆرە بۆی پاڕایەوە:

"ئەی خوای گەورە، لە تاوانەکانی عائیشە بە ڕابردوو و داهاتوو، ئاشکراو شاراوەیەوە، ببوورە!".

عائیشە زۆر دڵخۆش بوو بە نزاکەی و تەنانەت پێکەنی.

پێغەمبەرﷺ کە بەمجۆرە عائیشەی بینی، لێی پرسی:

"ئەی عائیشە ئایا ئەو نزایەی بۆم کردیت هێندە دڵخۆشی کردیت؟".

لە وەڵامدا عائیشە وتی:

"ئەی پێغەمبەری خودا، چۆن دڵخۆش نەبم!".

پێغەمبەر لە پڕ جدیەت گرتی:

"ئەی عائیشە، سوێند بە خودا لەدوای هەموو نوێژێکەوە من ئەو نزایە بۆ ئومەتەکەم دەکەم!".

ڕۆژێکیان جارێکی دیکە پێغەمبەرمانﷺدەستی هەڵبڕیبوو بەرەو ئاسمان و نزای بۆ دەکردین، بەدەم گریان و لاڵانەوەوە دەیوت:

"ئەی خودای گەورە، ئومەتەکەم بپارێزە! بەزەییت بە ئومەتەکەمدا بێتەوە".



بێگومان ئافرێنی مەزن، خۆی دەیزانی پێغەمبەرەکەی بۆ کێ و لەبەرچی دەپاڕێتەوە.

وەلێ فەرمانی بە فریشتە جبریل کرد:

"ئەی جبریل! هەرچەندە خوداکەت ئاگای لە هەموو شتێکە، بەڵام دیسان تۆ بچۆرە لای محمد لێی بپرسە بۆچی دەگری؟".

حەزرەتی جبریل چووە خزمەت پێغەمبەرﷺو پرسیاری هۆکاری گریانەکەی لێکرد.

ئەویش لە وەڵامدا پێی ڕاگەیاند کە بۆ ئومەتەکەی دەگری – واتە بۆ ئێمە–.

جبریل، گەڕایەوە بۆ حزووری پەروەردگاری و عەرزی کرد، پێغەمبەر بۆ ئوممەتەکەی دەگری.

خودای بێهاوتا و تاقانە فەرمووی:

"ئەی جبریل، بچۆرەوە بۆ لای محمد و پێی بڵێ، دەربارەی ئوممەتەکەت ئێمە تۆ ڕازی دەکەین و هەرگیز زویرت ناکەین".

## مافی شەفاعەت

خۆشترین سوپرایز بۆ ئەو مرۆڤانەی باوەڕی تەواویان بە خودا و پێغەمبەر هەیە لە ڕۆژی دواییدا، شەفاعەتە.

شەفاعەت واتە ناوبەندی کردن لەنێوان دوو کەسدا. بۆ نموونە: ناوبەندیکردن بۆ ئاسانکردنی کاری کەسێك، شەفاعەتە.

هەروەك چۆن: بوونە هۆکاری بەخشرانی کەسێك بەهۆی تاوانەکەیەوە ڕێك لەو کاتەی خەریکە سزا بدرێت، شەفاعەتە.

لەڕۆژی دواییشدا خودا مافی شەفاعەت دەداتە بەشێك لە بەندەکانی، بێگومان ئەو بەندانەی لای زاتی ئەو زۆر خۆشەویستن. مەزنترین شەفاعەتکار لەو ڕۆژەدا پێغەمبەری ئیسلامەﷺ، ئەوە شەفاعەت بۆ زۆرترین ژمارەی خەڵك دەکات.

پەروەردگار زۆرترین مافی شەفاعەتکردن دەداتە پێغەمبەری نازدارﷺ، لەو ڕۆژەدا کە تەواوی گرۆی مرۆڤ لە چاوەڕوانییەکی پڕ نیگەرانیدایە، زاتی بەدیهێنەر بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:

"ئەی محمد، شەفاعەت بکە! شەفاعەتت قبوڵە!".

پێغەمبەری ئازیزیش شەفاعەت بۆ تەواوی ئومەتەکەی دەکات.

ئیدی هەموو ئەو باوەڕدارانەی لە ناخەوە خودا و پێغەمبەرەکەیان خۆشویستووە، پشکی شەفاعەتەکەیان بەردەکەوێت.

هەندێك تەنانەت لێپرسینەوەشیان لەگەڵدا ناکرێت و ڕاستەوخۆ ڕەوانەی بەهەشت دەکرێن. هەندێکی دیکە لێپرسینەوەیان بۆ ئاسان دەکرێت و زووبەزوو دەرباز دەبن و تاوانەکانیان دەبەخشرێت.

مەیدانی حەشر پڕدەبێت لە سەدای خۆشی دەربڕینی شەفاعەت بۆکراوان.

ئافرێنی میهرەبان لەبەر خۆشەویستی پێغەمبەرەکەی هەتا دێت لە بەندەکانی خۆشدەبێت.

پاشان نۆبەی پێغەمبەرانی دیکە دێت، ئەوانیش شەفاعەت بۆ شوێنکەوتووانیان دەکەن.

دواتر بەندە سەرڕاستەکان لەو شەفاعەتەی پێیان بەخشراوە بەشی دۆستانیان دەدەن، واتە شەفاعەت بۆ ئەوانەی دیکە دەکەن بە ئەندازەی هەگبەکەیان.

لەبەر ئەم بەندانەش خودا لە کۆمەڵێکی دیکەی بەندەی خۆشدەبێت.

# شوێنی ژووان،
# حەوزی کەوسەر

بێباوەڕانی مەککە سەرەتای هاتنی ئیسلام سەرەڕای ئازاردانی لە ڕادەبەدەری پێغەمبەرﷺ، هاوکات قسە و قسەڵۆک و تۆمەت نەمابوو بۆی هەڵنەبەستن.

بۆ نموونە: پێغەمبەرﷺ هیچ منداڵی کوڕی نەبوو، بۆیە ناوناتۆرەی (ئەبتەر) واتە وەجاخ کوێریان لێنابوو. بۆ دەمکوت کردنی بێباوەڕان خودا سورەتی پیرۆزی (ئەلکەوسەر)ی ناردە خوارەوە.

لە سورەتی کەوسەردا خودا دەفەرموێت: "ئاوی کەوسەرمان داویتێ کە ناوی جۆگەیەکە لە بەهەشتدا، دەی تۆش نوێژ بکە بۆ خودای خۆت قوربانی بۆ بکە، بە ڕاستی ئەوەی خۆشیی لە تۆ نایێ خۆی وەجاخ کوێر و نەوە بڕاوەیە."

کەوسەر ناوی ڕووبارێکی بەهەشتە. ئاوی ئەم ڕووبارە لە ڕۆژی دواییدا دەڕژێتە حەوزێکەوە بەناوی حەوزی کەوسەرەوە.

لەڕاستیدا لەو دونیا هەر پێغەمبەرێك و حەوزێکی تایبەت بەخۆی هەیە. گەورەترینیان حەوزی کەوسەرە و وەك لە سورەتەکەدا هاتووە، بەخشراوە بە پێغەمبەری خۆمان.

وەك ئەو پێناسەیەی پێشەوامان ﷺ بۆی کردووە، ئاوی کەوسەر لە شیر سپیتر و لە هەنگوین شیرینترە.

لەسەروو هەموو ئەمانەشەوە ئەوەی جارێك لە ئاوەکە بخواتەوە ئیدی بۆ هەتا هەتایە تینووی نابێت.

دۆست و هاوەڵە نزیکەکانی لە پێغەمبەریان پرسی: ئەی نێردراوی خودا لە ڕۆژی دواییدا چۆن تۆ بدۆزینەوە؟ لەوەڵامدا پێغەمبەرﷺ ناونیشانی سێ شوێنی پێدان:

ئەو شوێنەی تەرازووی دادگەریی تێدا دادەمەزرێنرێت، پردی صیرات و حەوزی کەوسەر.

واتە حەوزی کەوسەر یەکێکە لە جێژوانەکانمان لەگەڵ خۆشەویستماندا.

لەکاتێکدا پێویستمان پێیەتی دەتوانین لەسەر حەوزی کەوسەر بیبینینەوە. ئەو لەوێ چاوەڕێی ئێمەیە، هەر کە بیبینینی دەستبەجێ دەماننناسێتەوە. هەرکەسێك لە دونیادا خۆشی بووێت، لەوێش لەسەر حەوزی کەوسەر دەیبینێتەوە، موسوڵمانان کاتێك چاویان پێی کەوت، بەرەو پیری هەڵدێن و دەستی موبارەکی ماچ دەکەن.

ئێمە بەتایبەت، لەبەرئەوەی لەم دونیایەدا بینینی ئەومان نەبووە بەش، بۆیە لەویٚ تێر تێر تاسەی دووریمان دەشکێنین.

لە ئاوی کەوسەر دەخۆینەوە.. هەم تینوێتیمان دەشکێت هەم تاسەی دووریمان لە خۆشەویستەکەمان.

هەرچی خوانەناسانیشە –ئەوانەی پێیان دەوت وەجاخکوێر– لەدوورەوە تەماشای ئێمە دەکەن چۆن وەك پەروانە بەدەوری پێغەمبەردا ﷺ دێین و دەچین.

ئیدی بە ناچاری لۆمەی خۆیان دەکەن و دەبێژن:

"تۆ بڕوانە ئومەتێکی چەند مەزنی هەیە... بەڕاستی ئێمەین وەجاخکوێر".



# چۆن لە پردی صیرات دەپەڕینەوە؟

کەسێك دوای بڕینـی ڕێگەیـەکی دووردودرێـژ و مەترسـیدار کاتێـك گەیشتە ماڵەوە هەناسەیەکی قووڵ هەڵدەکێشێت! ئیدی ئێرە جێگای پشوودان و ئارامی و دڵنیاییە.

خۆ لە ڕاستیدا گەر ئاستەنگ و زەحمەتەکانی ڕێگەی دوور و درێژ و پڕ مەترسی بهێنینە پـێش چاوی خۆمـان، ئـەوکات بـاش لـە نـرخ و گرنگی ماڵ تێدەگەین.

مـرۆڤ ئیـدی ئـەوکات نـاخی پڕدەبێـت لـە هەسـتی منـەتباری بەرامبەری خوداکەی کـە بـە سـەلامەتی ئەو ڕێگـە پـڕ کێشـەیەی پـێ بڕیوە، لەناخیەوە سوپاسی دەکات.

"سوپاس بۆ ئەو خودایەی لەو ڕێگا پڕمەترسییە پەڕاندمیـەوە و گەیاندمیە مەنزڵی ئارام و گەرم و گوڕ".

ڕێگای مرۆڤ هەرچەندە زیاتر ئاستەنگی تێدابووبێت، ئەوەنـدە بـە ئاسەوە نزا دەکات و بەو ئەندازەیە چێژ لە مەنزڵی ئارامیی و دڵنیـایی وەردەگرێت.

صیرات: واتە ڕێگا. پردی صیرات مەترسیدارترین پردە بەدرێژایی ژیانمان ڕێمان تێکەوتبێت.

چونکە ئەم پردە بەسەر دۆزەخەوە بنیات نراوە.

ئەمـە هەواڵێکـە پێغەمبـەرﷺ بەئێمـەی داوە. خـۆ هـەر شـتێك دەربارەی دواڕۆژ بزانین لە قورئان یاخود پێغەمبەری نازدارمانـەوەﷺ فێربووین.

وەك پێغەمبـەرﷺ ئامـاژەی پێـداوە، هـەموو مرۆڤـەکان بەسـەر پردی صیراتدا دەڕۆن.

یەکەم کەس کە بەسەریدا تێدەپـەڕێت، پێغەمبـەری ئیسـلامەﷺ، ئەمەش بۆ ئێمەی شوێنکەوتووانی بەخششێکی باشە.

چـونکە حـەزرەتی محمـدﷺ باشـترینی ڕێنیشـاندەرانە، ئەوانـەی بەڕێی ئەودا دەڕۆن و شوێنپێی هەڵدەگرن، هـەرگیز ڕێـی ڕاسـت هەڵـە ناکەن، هەردەم کورتترین و سەلامەتترین ڕێگا دەبێتە بەشیان.

هەروەك چۆن لە دونیادا ڕێنیشاندەر و ڕێبەرمانە، هەرواش لە دواڕۆژدا چاوساغ و ڕابەرمانە.

شوێنکەوتووانی دونیای، لەوێش ڕێچکەکەی دەگرنە بەر.

پێغەمبەرﷺ کاتێك بەسەر پردی صیراتدا تێدەپەڕێت دەم بە نزایە و دەڵێت:

"خودایە ئاسانی بکە! خودایە ئاسانی بکە!".

ئێمەش لەدوای ئەوەوە داوای ئاسانی دەکەین...

کەسانێك بە خێرایی ڕووناکی بەسەر پردەکەدا تێدەپەڕن، کەسانێکی هاوشێوەی ڕەشەبا، کەسانێك لە چاوتروکانێکدا.

هەرکەسێك چاکەکانی دونیای زیاتر بێت، خێراتر تێدەپەڕێت.

هەندێکی بەخێرایی باڵندە، هەندێکی بەخێرایی ئەسپ، کۆمەڵێك بەخێرایی ڕەوتی وشتر. وەلێ بێباوەڕان بەخودای تاقانە و ڕۆژی پەسڵان، ناتوانن پردەکە ببڕن.

ئەوانەی لە دونیادا هەرگیز گوێیان نەداوەتە ئامۆژگارییەکانی پێغەمبەر و شوێنی نەکەوتوون، لەوێش دەرفەتی شوێن پێ هەلگرتنیان نییە.

لەوانە دەبن کە دەکەونە خوارەوە... وەك دەشزانین خوارەوە دۆزەخە. بەهۆی ئەوەی باش هەڵەکانیان دەزانن، کاتێك دەکەونە خوارەوە دەڵێن:

(بەڵێ وەڵڵا. بەڕاستی پێغەمبەرمان هاتەسەر و لەم ڕۆژەی ترساندین، بەڵام ئێمە باوەڕمان پێنەکرد و بە درۆزنمان داناو وتمان: حاشا خوا هیچ ئایەتێکی نەناردووەتە خوار. ئێوە، ئەی ئەوانەی خۆتان بە فروستادەی خوا دائەنێن، لە گومڕاهییەکی گەورەدان، ئەیشڵێن: ئەگەر ئێمە گوێچکەمان ببوایە بۆ بیستنی قسەی پێغەمبەران یا هۆش و فاممان بوایە بیرمان بکردایەتەوە، ئێستا لە ئەهلی دۆزەخ نەئەبووین.) الملك: ٩-١٠.

ئیماندارانیش لە کۆتایی پردەکەدا هەناسەیەکی قووڵ هەڵدەکێشن و ئاهێك بەبەریاندا دێتەوە. چونکە دوای پردی صیرات، ئیدی دەرگای بەهەشت ئاوەڵادەکرێت.

بەڵێ، ئەمە ئیدی مەنزڵی ڕاستەقینەی بەڵێنپێدراومانە... ئەو ماڵەی خودا کردویەتی بە شوێنێکی ئارام و بێ کێشە و سەرئێشە و پڕ لە خۆشگوزەرانی و دوور لە هەموو دەردی سەرییەك.

لە دەروازەی بەهەشتەوە ئیدی ناخۆشی و سەختی قەدەغە دەبن، هەرچی پێی دەڵێن ئازار و ئەشکەنجە بوونی نامێنێت.

ئیتر بەندە سەرڕاستەکانی پەروەردگار بەمجۆرە باشتر تێدەگەن لەو هەموو چەرمەسەریەی چەشتویانە و لەدوای خۆیان جێیان هێشتوون.

بەوپەڕی دڵخۆشییەوە دەڵێن: (سوپاس بۆ ئەو خودایەی گفتی خۆی کە دابوورینێ، لەگەڵی هێنایەدی). الزمر: ٧٤.



# بەهەشت شوێنێکی چۆنە؟

بەرلەوەی تۆ بڵێیت با من خۆم بیڵێم! ڕاست دەکەیت، ئەوە خەریکە دەگەینە کۆتایی کتێبەکە -کە بە ناوی "تامەزرۆی ناسینی بەهەشتم"ەوەیە– هێشتا باسێکی ئەوتۆمان لەبارەی بەهەشتەوە نەکردووە. بەڵام بیرت نەچێت باسی ڕێگای چوون بۆ بەهەشتمان کرد...

دەربارەی مردن، گۆڕ، زیندووبوونەوە، مەیدانی حەشر، تەرازووی کێشانی چاکە و خراپە، هاودەمیی پێغەمبەرمانﷺ لەو ڕۆژەدا، پردی صیرات، حەوزی کەوسەر...هتد دواین.

ئەمانە ئەو شتانەن کە پێش چوونە بەهەشت دێنە ڕێگەمان.

وەلێ ئیدی ڕێگەی تووڵانی تەواوبوو. لە صیرات پەڕینەوە و گەیشتینە بەردەم دەرگای بەهەشت.

چیتر دەتوانین بە تێروتەسەلی لەبارەی بەهەشتەوە بدوێین. گومانم نییە من کە باسی دەکەم و تۆش کە گوێ دەگریت وەڕس نابین.

## ئایا بەهەشت چۆن شوێنێکە؟

گەر سەرنجت دابێت لە دەستپێکی ئەم کتێبەوە، ناوبەناو دەگەڕێینەوە بۆلای جیهانی ڕەحمی دایك. چونکە زۆر بابەتی ناو ڕەحمی دایك هەیە کە یارمەتیدەر دەبێت بۆ تێگەیشتن لە زۆر شتی دوارۆژ.

پێش ئەوەی بچینە سەر (بەهەشت)، تکات لێ دەکەم جارێکی دیکە ناوسکی دایك بهێنەرەوە بەرچاوی خۆت.

ئێستا بیر لەو ڕۆژانە بکەرەوە کە هێشتا لەدایك نەبووبوویت. ئەو ڕۆژانەی کە تەنیا کۆرپەیەکی بچووك بوویت.

ئەگەر ئەوکات دەربارەی ئەو دونیایەی لە داهاتوودا چاوی پێ هەڵدەهێنیت پرسیارم لێبکردیتایە، چ وەڵامێکت دەدایەوە؟ ڕاستر بڵێم، دەتوانی هیچ وەڵامێك بدەیتەوە؟

بێگومان نەتدەتوانی!

هیچ زانیاریەکت نەبوو سەبارەت بە جیهانی دەرەوە.



بـۆ نموونـە وێنـای ئاسمـانی شـین، هـەورەکان، باڵنـدەکان، مێشـهەنگەکان، گیانلەبـەر و مێرووەکـان کـار و بەرخۆڵـەکانت بـۆ نەدەکرا.

وێڕای وێنا نەکردن هاوکات ئەگەر بۆم بـاس بکردیتایـە، دیسـان تێنەدەگەیشتیت. لەبەرئەوەی ئەو دونیایەی تێیدا بوویـت زۆر جیـاواز بوو لەگەڵ ئەوەی بۆی دەچوویت.

ناوسکی تەنگ و تاری دایك لەکوێ و ئەم جیهانە پان و بەرین و ڕازێنراوەیە بە ئاسمان و، دەریا و زەریا و چیاکان و، دەشت و دۆڵی سەوزی فراوان، لەکوێ...

نەدەکرا بزانیت تا چ ڕادەیەك سەرزەوی جیاواز و ڕەنگاوڕەنگترە لە سکی دایك. کاتێك بەراوردی ئەم دونیایەش بە بەهەشت دەکەین، وەك سکی دایك.



بــه کــورتی ئێمــه نــاتوانین بــه بیرکردنــەوە و تێفکــرین تــەواو لــه جوانیەکانی بەهەشت بگەین.

بەهەشت گەلێك جوانترە لە جوانترین وێنە کە ئـەقڵمان پـەی پـێ دەبات، جێگایەکی زۆر سەرنجڕاکێشترە لە هەرچی شتی سەرسوڕهێن و ناوازە و دەگمەنی ئەم دونیایە.

بیر لە چەند دیمەنی دڵڕفێن دەکەیتەوە و چـەند جـوانی دێـت بـه خەیاڵتدا، بزانە ئەوە بەهەشت نییە و بەهەشت لەو دڵڕفێنترە.

## ئایا بەهەشت بە هیچ جۆرێك لە دونیا ناچێت؟

بەهەشت هەم لە دونیـا دەچـێت، هـەم ناچـێت! بـۆ نموونـه وەك ئێرە لەوێش درەخت هەیـە. هەرچـەند ئێمـه درك بـه "درەختبـوونی" ئەوان دەکەین، بەڵام دیسان درەختی ئەوێ لەوانی ئێرە ناچێت.

(ئەهلی بەهەشـت لـه بەهەشـتا پـاڵ ئەدەنـەوە بـه قەنەفـەوە نـه هــەتاو ئــەبینن و نــه ســەرمای ســەخت. ســێبەری درەختــەکانی بەهەشـت نزیکـه بەسـەر سـەریانەوەو چـنینی میـوەی درەختـەکانی بەهەشتیان بۆ ئاسان کراوە بە ئاسان کردن.) الإنسان: ١٣-١٤

دەڵێیت، مادام هەردووکیان درەختن، ئیدی دەبێت چ جیاوازییەکیان هەبێت؟ کەوایە لەناخی دڵتەوە بپارێرەوە کە هەردووکمان بەهەشتی بین و لەوێ پێکەوە درەختەکانی ببینین.

ئەوکات بە ئاسوودەیی پێت دەڵێم:

"ئەوەتا بنوارە! بینیت؟ قەت پێشبینیت دەکرد درەختی بەهەشت لە درەختی دونیا هێندە جوانتر و جیاوازتر بێت، یاخود دەتوانی وێنای بکەیت؟ "

هاوشێوەی دونیا لە بەهەشتیش میوە هەیە...

هەرچەندە لەوانەیە خودای توانا میوەی جیاوازیشی لە بەهەشتدا بەدیهێنابێت. بەڵام دیسان میوەکانی ئێرەشمان لەوێ هەر دەست دەکەوێت. بۆ نموونە: سێو، پرتەقاڵ، هەنار، هەنجیر، ترێ،...هتد.

کاتێک چاومان پێیان کەوت ئیدی بە خۆمان دەڵێین: "ئەوە سێوە، هەنارە، هەنجیرە... لە دونیاشدا تاممان کردبوو!!!

(موژدە بدە بەوانەی ئیمانیان هێناوەو چاکەیان کردووە کە لە قیامەتدا ئەبنە خاوەنی باغ و باغاتی وەها جۆگا بەناویانا ئەڕوات، کە لە بەری ئەو باغ و بەهەشتانە ڕزقێکیان بۆ بێت ئەڵێن: ئەمە ئەو خواردەمەنییەیە کە لە دنیادا بۆمان ئەهێنراو ئەمانخوارد چونکە ڕزقیان لەسەر وێنەی هی دنیا بۆ ئەهێنرێ.) البقرة: ٢٥.

**(ئەوانە ڕۆزییەکی دیاری کراویان لە لایەن خواوە بۆ هەیە.)** الصافات: ٤١.

وەلێ تام و بۆنی میوەکانی بەهەشت بە ئەندازەیەکی وا جیاوازە کە ئێستا وامان لێدەکات بڵێین: بۆ زانینی چێژی سێوێکی بەهەشت، هەنجیرێکی بەهەشت، هەنارێکی بەهەشت... دەبێت بچینە بەهەشت خۆی و لەوێ بۆمان دەرکەوێت.

بەڵام خۆ هیچ نەبێت دەتوانین بڵێین: " ئەگەر میوەی ئەم دونیا ئەوەندە بەلەزەت بێت، ئەی دەبێ میوەی بەهەشتی بێوێنە چ تامێکی هەبێت! ".

پرسیار: ئایا لە بەهەشت تەنیا درەخت و میوە هەیە؟

بێگومان نەخێر!

بەو پێیەی نیعمەتەکانی دونیا تەنیا درەخت و میوە نین، بۆیە بێشك نیعمەتگەلێکی لە ژمارە نەهاتوویش لە بەهەشت چاوەڕێمانە...

**(لە بەهەشتا میوەیان بۆ هەیە و هەرچی داوابکەن لە بەهەشتا بۆیان هەیە.)** یس: ٥٧.

ناسینی بەهەشت بە جوانترین شێوە لەڕێی ئایەتەکانی خاوەنی بەهەشتەوە مومکینە.

کەوایە با گەشتێك بەناو قورئاندا بکەین و بخوێنینەوە.



**(جلوبەرگی ئاوریشمی ناسك و ئەستوور لەبەرئەكەن و لە بەرانبەری یەكەوە دائەنیشن.)** الدخان: ٥٣.

**(نموونەی ئەو بەهەشتەی گفتی بەوانە پێ دراوە كە خۆیان لە كوفرو گوناه ئەپارێزن، ئەوەیە جۆگەو ڕووباری ئاوی بۆگەن نەكردوو و جۆگەی شیری تام نەگۆڕاوو جۆگەی شەرابی مایەی لەزەت و خۆشی بۆ ئەوانەی ئەیخۆنەوەو، جۆگەی هەنگوینی پاڵفتەكراوی تیایە. هەموو جۆرە میوەیەكیشی بۆیان تیایە لەگەڵ عەفوو لێبووردن لە خوای خۆیانەوە.)** محمد: ١٥.

(بەڕاستی خوا ئەوانەی کە ئیمانیان پێ هێناوەو کرداری چاکەیان کردووە ئەیانخاتە ناو بەهەشتگەلی واوە جۆگەئاو بەژێریانا ئەڕواو، لەو بەهەشتگەلەدا بە بازنی زێڕین و بە مرواری جوان ئەکرێن و ئەڕازێنرێنەوەو بەرگیان لە بەهەشتدا ئاوریشمە.)
الحج: ٢٣.

(لەسەر تەختی خەوی بەتاڵیزێڕوزیوتەنراوە کە دوڕو یاقووتی پێوە کراوە. پاڵیان لەسەر داوەتەوە لە بەرانبەری یەکترا. بەسەریانا ئەگەڕێن بۆ خزمەتکردنیان چەند مێردمنداڵێکی هەمیشە بەو حاڵە ماوەو نەگۆڕاو. بە پیاڵەی بێدەسك و لوولەو گۆزەی دەسك و لوولەدارو بە کاسەی شەرابی ساف و بێگەردەوە. سەریان بە خواردنەوەی ئەو شەرابە نایەتە ئێش و هۆشیان لەدەس ناچێ و سەرخۆش نابن. ئەو مێردمنداڵانە میوەیان بەسەردا ئەگێڕن لەو جۆرەی خۆیان هەڵیئەبژێرن. گۆشتی پەلەوەریشیان بۆ دێنن لەو جۆرەی خۆیان حەزی لێ ئەکەن. حۆریی چاو قەوییشیان هەیە. لە وێنەی مرواریی لەناو سەدەفا داپۆشراو. هەموو ئەمە لە پاداشی ئەو کردەوە باشانەدا کە لە دنیادا ئەیانکردن. لە بەهەشتا واتەیێ نابیسن کە بێسوودو هیچوپووچ بێ یا تاوانبارکردنیانی تیابێ. تەنها هەر وتەی (سەلام .. سەلام) ئەبیسرێ. هەرچی ئەوانەی خاوەنی لای ڕاستن، واتە دەفتەری کرداریان ئەدرێتە دەستی ڕاستیان، تۆ چوزانی ئەوانەی خاوەنی لای ڕاستن، چین؟ لەناو

مۆردی دڕك لێكراوەدان. لەناو دارمۆزی بەر لە خوارەوە بۆ سەرەوە ڕیزكراودان. لە پەنای سێبەری پەل كشاویشدان كە هەرگیز كورت نابێتەوەو زیادو كەم ناكا. لای ئاوی داكراوان واتە هەركاتێ بیانەوێ بۆیان دائەكرێ بیخۆنەوە. لەناو میوەی زۆریشدان. كە نە ئەبڕێتەوەو نە لێیان ئەگیرێتەوە. لەناو فەرش و ڕایەخی بەرزكراوەدان كە چین لەسەر چین لەبان یەك دانراون.) الواقعة: ١٥-٣٤.

(كانیاوێكی ڕەوانی تیایە. چەندین تەختكەلی بەرزو بڵندیشی تیایە. چەندین پەرداغی دانراویشی تیایە. چەندین پشتیی ڕیزكراویشی تیایە. چەندین فەرشی ڕاخراویشی تیایە). الغاشیة: ١٢-١٦.

(ئەمە گشتی لە لوتف و كەرەمی خوای تۆوەیە لەگەڵیان و دەسكەوتی گەورەیش هەر ئەمەیە.) الدخان: ٥٧.

## ئایا لە بەهەشتدا هەموو خواستەکانمان بەجێدێن؟

بەو پێیەی بەهەشت جێگای ئاسوودەییە و بۆ بچووکترین شتیش مرۆڤ تێیدا زویر ناکرێت، کەواتە هەموو خواست و داواکاریەکانیشمان دێنەدی.

(بۆ ئەهلی بەهەشت لەو بەهەشتەدا کە گفتیان دراوەتێ پێی، هەرچی شتێ خۆیان ئارەزووی بکەن هەیە. هەمیشەیش لەو بەهەشتەدا ئەمێننەوەو قەت لێی ناچنە دەرەوە.) الفرقان: ١٦.

(لە بەهەشتا ئەوەی نەفسی ئادەمزاد ئارەزووی بکاو چاو لەزەتی لێ وەربگرێ هەیە) الزخرف: ٧١.

(هەرچییان ئارەزوو لێ بێ بۆیان هەیە لەو بەهەشتەداو لەوەیشمان زیاتر لایە بۆیان). ق: ٣٥.

ئەوەی ئارەزووی فڕین دەکات وەك باڵندە لە شەقەی باڵ دەدات، ئارەزوومەندانی سوارچاکی سواری ئەسپی نایاب دەبن.



هەرکەسێك حەزی لە ماسی گرتن بێت، ڕاوەماسی دەکات...
هەرکەسێك ئارەزووی باخداری هەیە گوڵ و گوڵزار پێدەگەیەنێت...
بەڵام هاوشێوەی ئەوەی ئێرە ئەرك و ماندووبوونی ئەوتۆی نییە...

بەپشتیوانی خودا هەرشتێك لە دونیادا ویستومانە بیکەین و دەستی نەداوە، لە بەهەشتدا بەرجەستەیان دەکەین.

ماوەیەك من بۆ خۆم ڕیزبەندی ژمارەیەك شتم نووسیبوو. پاشان وتم:"نا، قەید ناکا. تۆ با جارێ بچینە بەهەشت، دواتر بیردەکەمەوە چی بکەم و چی نەکەم".

گـەر حەزدەکـەیت یـەکێك لـەو هیوایەتانـەت پـێ دەڵـێم کـە نووسیبومن، ئەسپ سواری! بـەڵێ، مـن تـاکو ئـەم تەمەنـەم سـواری ئەسپ نەبووم! کەچی هەردەم بیرم لەوە کردووەتـەوە، گـەلۆ ئەسـپ سـواری بـە ئەسـپێکی بـەرزی ناوقـەد پـانی تـووکنی تـووك نـەرم لـە دەشتێکی پان و پۆڕی سەوزدا، چۆن هەستێك بە مـرۆڤ دەبەخشـێت؟ پێم وایە لەم دونیایەدا بواری هێنانەدی ئەم ئاواتەم نییە، بەڵام بەڵێنم داوە کاتێك چوومە بەهەشتەوە یەکەم کارم ئەوە بێت.

لـە چـاخی خۆشـگوزەرانیدا (سـەردەمی پێغەمبـەر و هـاوەڵانی)، هاوەڵێك لە پێغەمبەری پرسی" ئەی پێغەمبەری خودا، من زۆر حـەزم لە ئەسپە. ئایا لە بەهەشتدا ئەسپ هەیە؟".

لـە وەڵامـدا پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: گـەر چـوویتە بەهەشـتەوە، ئەسپێکی لە یاقووتی سووردروستکراوت پێ دەبەخشرێت کە دوو باڵی هەیە و، بەسەر پشتیەوە بۆ هەر کوێ بتەوێت دەتبات.

(بێگومـان ئێمـە پاداشـی چاکەکاران بـەم جـۆرە ئەدەینـەوە.)
المرسلات: ٤٤

## ئایا شتێك هەیە لە بەهەشتدا نەبێت؟

ئەدی چۆن! بێشك لە بەهەشتدا هەندێ شت نییە.

شتانێك گەر بەدوایشیاندا بگەڕێیت نایانبینیتەوە.

وەلێ بەهەشتیەکانیش خۆیان خوازیاری گەڕان نین بەدوای ئەو شتانەدا...

بۆ وێنە تووڕەبوون، هەڵچوون، ئیرەیی بردن، درۆ و دەلەسە و هەڵخەڵەتاندن، باسکردنی خەڵکی لە پاشەملێ، شەڕ و بەزم، ناوناتۆرە، تۆمەت هەڵبەستن، قسەهێنان و بردن، ستەمکردن، دزی، هەڵخەڵەتاندن، خیانەت... ئەمانە و هەرچی کردە و گوفتەی ناباشی هاوشێوە هەیە لە دەرگای بەهەشتەوە دەربازبوونیان بۆ نییە.

وەك پاداشتێك بۆ ئەو ڕاستکارانەی لە دونیادا خۆیان لە خراپە پاراستووە، لە بەهەشتدا خودای باڵادەست لێیان دەپارێزێت...

(بەڕاستی ئەو کەسانەی لە دنیادا لە خوا ترساون لە پایەو شوێنێکی وادان لە دەردو ئازار ئەمینن.) الدخان: ٥١.

بە کورتی ئەوەی لە بەهەشت دەست ناکەوێت، ئەمانەیە. بە پشتیوانی خودا ئەگەر بچینە بەهەشتەوە چەند بارگرانییەکی دیکەی وەك: نەخۆشی، ئازار، ماندوێتی، بێتاقەتی، بێخەویی، ...هتد، نابینیت.

نا، نەخێر. ئەوەی بیستت ڕاستە!

لە بەهەشتدا خەو نییە. چونکە دانیشتوانی ئەوێ هەرگیز خەویان نایەت، پێویستیان بە خەوتن نییە.

ئەوە زۆرباشە ئیدی!

کە ئەو هەموو شتە خۆشە هەبێت ئیتر بۆچی خەڵك بیەوێت بخەوێت؟ هاوکات خەڵکی بەهەشت پێویستی تەوالێتیشیان نییە.

تا دەتوانین لە خواردن و میوەی بەهەشت دەخۆین، وەلێ هەرگیز وامان لێ نایەت بڵێین: "ئای خوایە، زۆرم خوارد، زۆر تەنگاوم" و بۆ دۆزینەوەی تەوالێت بەملاو بەولادا ڕابکەن.

بەو پێیەی پێغەمبەری نازدار ﷺ هەواڵی داوە، بەهەشتیەکان پێویستیان بە تەوالێت نابێت لەبری ئارەق دەکەنەوە. بەلام ئارەقەکەشیان بۆنی میسکی لێدێت.

دەپرسی: تەواو؟ نەخێر تەواو نەبووە!

لە بەهەشتدا کار و خەبات و سەعی کردنیش نییە!

چونکە بەهەشت جێگای پاداشت وەرگرتنەوەیە. لەوێ پاداشتی پەرستش و کاری چاکە و خۆپاراستن لە خراپە وەردەگرین و بۆ هەتاهەتایش پاداشتەکە بەردەوام دەبێت.

لە ژیانی ئەم دونیادا چەندە چاکە بکەین، ئەوەندە زیاتر پاداشت وەردەگرین...

"چی، وتت نوێژ؟".

"نەخێر لە بەهەشتدا نوێژکردن نییە. نوێژ پەرستشێکی فەرزە لەسەرمان لە دونیادا وەلیّ لە بەهەشتدا نییە".

سەرەڕای هەموو ئەمانە، لە ڕیزی "نەبوو"ەکانی بەهەشتدا شتێکی دیکەش هەیە ئەویش "مردن"ە !.

(مەرگ ناچێژن لە بەهەشتا لەو مەرگە بەولاوە کە یەکەم جار لە دنیادا چەشتوویانە و مردوون و، پەروەردگاری خۆیان ئەیانپارێزێ لە ئاگری دۆزەخ.) الدخان: ٥٦.

## جاویدانێتی بەهەشت...

جاویدانێتی بەهەشت وتی: کە چوویتە بەهەشتەوە ئیدی جارێکی دیکە ناچیتە دەرەوە!

(هیچ ئەلەم و ئازاریّ ناگا بە لەش و دڵیان و لەو بەهەشتانەیش دەرناکرێن.) الحجر: ٤٨.

گەر یادت بێت پێم وتیت: لە بەهەشتدا نیعمەتگەلێك هەیە هەرگیز لێرە نەتبینیبوون، ترۆپکی ئەوان (نەمری)یە.

چونکە لە دونیادا هیچ شتێك نەمر نییە.

لێرە کات وەك ئاوی ڕووبار هەردەم ڕێدەکات.

چرکە، خولەك، کاتژمێر، ڕۆژ، مانگ و ساڵ یەك بەدووی یەك دەکەون.



وەرزەکانی ساڵ دێن و تێدەپەڕن، هیچ پەلی درەختێك تاهەتایە پشکداری (بەهار) نابێت.

جوانی هیچ گوڵێك تا سەر بۆ باخچەکان نامێنێتەوە، چونکە بڕسکان و سیس بوون حاشا هەڵنەگرە.

لێرە ڕۆژێك دێت، هاتووان دەچن، لاوان پیردەبن، تازەکان کۆن دەبن، دیدەنیەکان ماڵئاوایی لەیەك دەکەن.

لێرە هەموو شتێك کۆتایی هەیە...

خواردنی سەر خوانەکان، میوەی ڕەز و باخەکان، مێش هەنگی پووره و هەنگوینی نێو بەندی شانەکان بە کۆتا دەگەن.

ڕۆژان تێدەپەڕێت و دواجار ژیانیشمان تەواو دەبێت و دەگاتە خاڵی کۆتایی.

ئەمە لەکاتێکدایە کە هەردەم خواستی (هەمیشە ژیان) لە ناخماندا دەنگ دەداتەوە. دڵمان ڕازی نییە بە تەواوبوونی هیچ کام لەوانەی ئاماژەمان پێکردن.

دەخوازین دارو درەخت هەمیشە سەوز بێت، خونچە و گوڵ هەردەم دەم بە پێکەنین بن، هەر چوار وەرز بەهار و، تەمەنمان هەر لاوێتی بێت.

واتە گەورەترین هیڤیمان لە دونیادا (نەمری)یە، بەڵام لە دونیادا "نەمری"نییە.

چونکە دونیا (فانی)یە. فانی: واتە ڕۆژێك کۆتایی دێت، دێت و دەڕوات. بەڵام بەهەشت فانی نییە.

لە بەهەشت گوڵەکان سیس نابن.

لە بەهەشت، بەهار کۆتایی نایەت.

لە بەهەشت، میوەکان قەت تەواو نابن.

لە بەهەشت، هیچ شتێك کۆن نابێت.

لە بەهەشت، تەمەن تێناپەڕێت.

لە بەهەشت، کەس پیر نابێت.

لە بەهەشت، کەس نامرێت.

لە بەهەشت، خۆشەویستان هەرگیز لێك جودا نابنەوە.

چونکە بەهەشت شوێنێکە تێیدا خودا (بوون)ی کردووە بە (جاویدانی).

(ئەو کەسانەیش کە ئیمانیان هێناوە و کردەوەی باش ئەکەن لەمەوپاش ئەیانخەینە چەند باغ و لالەزارێك کە جۆگای جوان و سازگاریان بە ناودا ئەڕوات و هەتا هەتایە لەو شوێنە خۆشەدا دەمێننەوە). النساء: ٥٧.

## ئایا لە بەهەشتدا وەڕس دەبین؟

لە دونیادا گەر خواردنێك –ئەگەر چی خۆشیش بێت– سێ جار لەسەر یەك بیخۆین لێی وەڕس دەبین. خۆشترین میوە هەفتەیەك لەسەر یەك بێتە بەردەستمان ناڕەزایی دەردەبڕین... ئەگەر سێ شەو و ڕۆژ لەگەڵ هاوڕێیەکماندا گفتوگۆ و دەمەتەقێ بکەین، ڕۆژی چوارەم بەدوای ڕێگای دەربازبووندا دەگەڕێین.

کەوایە چۆن وەڕس نابین لە باخ و باخچە، ڕووبار و سەوزایی، ئەسپی خۆشڕەو و جلوبەرگی ئاوریشمی، خواردن و میوەی دەگمەن، نیعمەتە لە بن نەهاتووەکانی دیکەی بەهەشت؟

دواجار ئەمانەش دووبارەن و بۆ هەتاهەتایە دووبارە دەبنەوە؟

پێش هەموو شتێك دەبێت بزانین لە بەهەشتدا هۆكارێك نییە بۆ بێزاربوون، تەنانەت خودی بێزاربوونیش نییە، بەكورتی لەوێ هەستێك نییە بۆ وەڕس بوون.

ئێستا پرسیارێكت لێ دەكەم: دەزانم زۆر حەزت لە سێوە، وەلێ گەر هەموو ڕۆژێك چەند جارێك سێو بخۆیت لێی بێزار دەبیت. وات لێدێت حەزدەكەیت بۆ ماوەیەك سێوت بەرچاو نەكەوێت. چونكە تامی تەواوی ئەو سێوانەی خواردوتن كەم تا زۆر وەك یەكن.

دوای ماوەیەك وا هەست دەكەیت بەردەوام هەمان جۆری سێو دەخۆیت.

بۆیە لە سێو وەڕس دەبیت.

باشە ئەی ئەگەر هەر سێوێك كە دەیخۆیت لەوەی پێشتر خۆشتر بێت و تامێكی جیاوازی هەبێت چی؟

بەڵێ، ئیدی ئەوكات وەڕس نابیت، گەرچی هەفتەیەك یان مانگێك بەردەوامیش سێو بخۆیت دیسان بێزار نابیت...

سێوەكانی بەهەشتیش بەم شێوەیەن. هەروەك چۆن بەهەشت خۆی ناكۆتایە، هەرواش نیعمەتەكانی ناوی لە فرەجۆریدا ناكۆتان.

بۆ وێنە تامی سێوەكانی ئەوێ لە فرەجۆریدا ناكۆتایە. هەر سێوێك لەوێ پێشكەشمان دەكرێت لەوی دیكە جیاواز و بەتامترە.



خۆ لە دونیاشدا نموونەیەکی بەرجەستەی ئەوە دەبینین.

خودا سێوەکانی دونیای بەجۆری جیاواز بەدیهێناوە، هەندێ سێو شیرینە، هەندێك ترش، هەندێك ڕەق، هەندێ ئاودار، هەندێکی تر...

ئەو خودایەی لە دونیادا جۆری جیاوازی سێوی بەدیهێناوە، لە بەهەشتیشدا لە هەر جۆرێك جۆریچکەی جیاوازتر بەدیدەهێنێت.

کاتێك بەم جۆرە بێت.. هەرگیز ناڵێین: بەسە ئیدی، لە خواردنی سێو وەڕس بووم.

ئێستا خۆت لەبەر ڕۆشنایی ئەم نموونەیەدا بیر لە نیعمەتەکانی دیکە بکەرەوە و بیاننرخێنە.

ئەنجامدانی کارێك لە دونیادا —ئەگەرچی بەچێژترین کاریش بێت لامان— ماندوومان دەکات. بەهۆی ماندووبوونیشمانەوە نەختێکیش بێزار دەبین.

پیاسەکردن و گەڕان بەناو قەشەنگترین باخ و سەوزایی ئەم دونیایەدا بۆ ماوەیەکی زۆر، وامان لێدەکات سکاڵا دەرببڕین: "بەسە ئیتر، بێزاربووم لە گەڕان".

خۆ لە ڕاستیدا لە پیاسەکردن و ئەو دیمەنە دڵڕفێنانە بێزار نابین، بەڵکو هۆکاری بێزارییەکە ماندووبوونمانە.

وەلێ لە بەهەشت شتێك نییە پێی بڵێین (ماندووبوون) هەر بۆیە بێزار و وەڕس نابین.

دەمەوێت ئەوەش بڵێم کە: بە پشتیوانی خودا ئەگەر بچینە بەهەشتەوە، بەم جەستەی ئێستامانەوە ناچین، بەڵێ ڕاستە ئێمە دیسان هەر خۆمان دەبین، بەڵام ئامرێنی بەتوانا جەستەمان بەشێوەیەکی گونجاو بە بەهەشت دەئافرێنێت.

نموونەیەکی ساکارت بۆ دەهێنمەوە تاکو تێبگەیت:

دەچیت بەرنامەیەکی نوێی کۆمپیوتەر دەکڕیت، بەرنامەکە تەواو نوێ و پێشکەوتووە و کۆمپیوتەرەکەی تۆش تایبەتمەندییەکانی کۆنن، کارتی شاشە و ڕامەکەی بەش ناکەن.

دەبێت کارتی شاشە و ڕامەکەی بۆ بگۆڕیت، تاکو کار بە پرۆگرامە نوێیەکە بکەیت. دوو ڕێگە هەیە: یان دەبێت ئەو

تایبەتمەندییانەی کۆمپیوتەرەکەت بگۆڕیت یاخود ئەستەمە کاری پێ بکەیت.

هاوشێوەی ئەمە، ئەگەر ئێمەش بەم حاڵەی ئێستامانەوە بچینە بەهەشتەوە، کەیف و خۆشیەکەی ناچێژین.

بە چاو، گوێچکە، قاچ و دەست، لووت و دەم و زمانێکی شیاو بە بەهەشتەوە دەچینە ئەوێ.

ئەگەر لەم دونیا کەموکوڕییەکی جەستەییشمان هەبێت، لەو دونیا بۆمان تەواو دەکرێت، هەموو کەسێك جوان و قەشەنگ و لاوە.

بەکورتی: هیچ خەمی ئەوەت نەبێ لە بەهەشتدا بێزار بیت، چونکە وەڕس نابیت!

## ئایا لە بەهەشتدا چاومان بە پێغەمبەر ﷺ دەکەوێت؟

بێشك لە بەهەشتدا چاومان بە پێغەمبەرمان (محمد) ﷺ دەکەوێت، خۆ یەکێك لە بەخششە مەزنەکان کە پێمان دەدرێت هەر ئەمەیە. کە بە درێژایی تەمەنمان خەمی دووریی و نەبینینی ڕووخساری پیرۆزی و ماچکردنی دەستی موبارەکی ئەو خۆشەویستەین و، تەنانەت ئاواتی ئەوە دەخوازین لەخەودا ببینین، ئیدی لە بەهەشت هەرکاتێك دڵمان بخوازێت دەتوانین بچینە دیداری.



جارێـک هــاوەڵانیش لــە خــەمی ئــەوەدا پرســییان: "ئایــا لــە دواڕۆژیشدا دەتوانین ببینــەوە پەروانــەی دەوری و بچینە دیداری؟".

بگرە ترسیان لێ نیشتبوو لەوەی نەیبیننــەوە. کاتێک ئــەم بابەتــەیان لای پێشەواکەیان کردەوە، وەڵامێکیان وەرگرت کە هەتاهەتایە مایەی دڵشادیان بێت.

"هەرکەسەو هاودەمی خۆشەویستەکەی دەبێت".

ئەم هەواڵە زیاتر لە هەر شتێکی دیکە هاوەڵانی شادومان کرد.

چونکە ئەوان پێغەمبەریان ﷺ زۆر خۆشدەویست. بەرپێیەی پێغەمبەرەکەمان زۆر خۆشدەوێت، کەواتە ئێمەش هاودەمی دەبین و بە پشتیوانی خودا تا سەر لەگەڵیدا دەمێنینەوە.

لە بەهەشتدا پێغەمبەرانی دیکەش دەبینین. بۆ نموونە دەچینە لای حەزرەتی باوکە "ئادەم"و داوای لێ دەکەن باسی چیرۆکی هاتنە سەرزەویمان بۆ بکات.

لە زمانی پێغەمبەر نووحەوە (سەلامی خوای لێ بێت) چیرۆکی لافاوە مەزنەکە دەبیستین. تکا لە پێغەمبەر ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت) دەکەین ڕووبەڕووبوونەوەیمان لەگەڵ نەمروددا بۆ باس بکات. پێغەمبەر مووسا (سەلامی خوای لێ بێت) تێکۆشانەکەی دژی فیرعەون. پێغەمبەر یووسف (سەلامی خوای لێ بێت) چیرۆکی فڕێدانە ناو بیرەکە. پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) هەڵکشانی بۆ ئاسمان بۆ ئێمەی بەهەشتیی ڕووندەکاتەوە.

ئەوان لە ژێر سێبەری درەخت و کانی و ڕووبارەکاندا هەریەکە و چیرۆکی خۆیمان بۆ دەگێڕێتەوە.

بەدەر لەمە، چاومان بە خەلیفەکانی ڕاشیدین حەزرەتی ئەبوبەکر، عومەر، عوسمان، عەلی (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەکەوێت. تێر تێر گوێش بۆ ئەوان هەڵدەخەین.

هاوەڵانی دیکەش دەبینین، پێکەوە دادەنیشین گفتوگۆ دەکەین، بۆ نموونە من وەك خۆم داوا لە حەزرەتی ئەنەس دەکەم (ڕەزای

"هاوڕێیەکم هەبوو لە دونیادا هەمیشە لێی دەپرسیم: ئایا تۆ بڕوات بە زیندووبوونەوە هەیە دوای ئەوەی ئێسك و پرووسك و ئەندامەکانی جەستەمان دەبنە خۆڵ و ئاوێتەی زەوی دەبن؟ ئایا بڕوات بە لێپرسینەوە هەیە؟"

دۆستان دەزانن ئێستا ئەو هاوڕێیەم لە چ بارێکدایە؟

تەماشایەکی دۆزەخ دەکات و لەوێ دەیبینێت. دەڵێت:

(قەسەم بە خوا نزیك بوو بمفەوتێنی و ببی بە هۆی کافربوونم. ئەگەر نیعمەتی خوای خۆم نەبوایە منیش یەکێك ئەبووم لەوانەی ئامادەی ناو دۆزەخ کراون. جا توخوا بەڕاست ئێمە لەوانە بووین کە نەمرین. تەنها مردنی یەکەممان نەبێ و، لە قیامەتا سزامان نەدرێ؟) الصافات: ٥٦-٥٩

## ئایا لە بەهەشت دەتوانین زاتی مەزنی خودا ببینین؟

خودا پاداشتێکی هێندە بەنرخ و سەرسوڕهێنەری هەیە بۆ بەندە بەهەشتیەکانی کە تەواوی پاداشتەکانی دیکە دەشارێتەوە لە جوانیدا.

قورئان بەم شێوەیە بۆمان باس دەکات:

**(بۆ ئەو کەسانەی چاکە ئەکەن و لە خودا ئەترسن پاداشی زۆر چاك هەیە لەگەڵ زیادەدا)** یونس: ٢٦.

بەوپێیەی جوانترین دیاری "بەهەشت"ە، ئەی دەبێت لەو بەنرختر چی بێت؟

لەو بارەیەوە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ:

"کاتێك خەڵکی دەچنە بەهەشتەوە، فریشتەیەکی کارپێسپێراو بانگیان دەکات و دەڵێت: "خودای گەورە بەڵێنێکی بە ئێمە دابوو، ئێستا دەیەوێت بەجێی بهێنێت".

بەهەشتیەکان دەڵێن: "ئەدی خودا بە ڕزگارکردنی لە دۆزەخ و بەخشینی بەهەشت پێمان ڕووی سپی نەکردین؟ لەمە زیاتر دەبێ چ بەڵێنێك بێت؟".

لەوکاتەدا خودای باڵادەست و جوانکار پەردەی نێوان خۆیی و بەندەکانی لادەدات، ئیدی ئەوان نووری الله دەبینن.

سـوێند بـەخودا، بەهەشـتیەکان لـە بەهەشـتدا هـیچ نیعمـەتێك هێندەی بینینی خودا مایەی دڵخۆشی نییە بۆیان.

باشـە چـۆن خـودا دەبیـنین؟ پێغەمبـەری نـازدارﷺ لـە فەرموودەیەکی دیکەدا وەڵامی ئەمەش دەداتەوە:

"ئایا لـە شـەوێکدا کـە ئاسمـان سـایەقە بێـت، بـۆ بینینـی مـانگ دەکەونە پاڵپاڵێن و کێبڕکێ؟".

نەخێر!

لە ڕۆژێکدا کە ئاسمان سـایەقە بێـت و هـەوری پێـوە نـەبێت، بـۆ بینینی خۆر دەکەونە پاڵپاڵێن و کێبڕکێ؟

نەخێر!

بـەڵێ، بـەو ئاسـانی و سـاناییە و بـە ئاشـکرا خـودای خۆتـان دەبیـنن.. بێگومـان ئێمـە کـە نـاتوانین وێنـای پاداشـتەکانی دیکـەی بەهەشت بکەین، لەم دونیایەدا ناشتوانین بە بەخششی بینینـی زاتـی خودا -کە تەواوی بەخششەکانی دیکە دەخاتە پێچەوە- تێبگەین.

# ئایا کێ دەچێتە دۆزەخەوە؟

ئەگەر دوو ڕۆژ بەر لە تەواوبوونی ساڵێ خوێندن و داخرانی دەرگای قوتابخانە، بەڕێوبەر خۆی بکات بە پۆلەکەتدا و بڵێت:

"قوتابیانی خۆشەویست، هەندێك لە ئێوە بەدرێژایی وەرزی خوێندن بەوپەڕی توانایەوە خوێندوویەتی و هەوڵی داوە. هەرگیز کەمتەرخەمی لە ئەرکی ماڵەوە نەکردووە، بۆیە کەم خەو بووە و تێر دڵی خۆی یاری نەکردووە... گوێڕایەڵی مامۆستاکانی بووە، فەرمانەکانیانی بەجێهێناوە و ئەوەی وتویانە مەیکە نەیکردووە.

گوێڕایەڵی دانەدانەی یاساکانی قوتابخانە بووە، لە پۆلدا هاروهاجی نەکردووە، مامەڵەی خراپی لەگەڵ هاوپۆلەکانیدا نەکردووە، گەر لە نەزانی هەڵەیەکی کردبێت داوای لێبوردنی کردووە.

هەندێکیشتان نە وانەکانی خوێندووە و نە ئەرکی ماڵەوەشی بەجێهێناوە. گوێی بۆ مامۆستا ڕانەگرتووە و هاروهاجی نەماوە لە پۆلدا نەیکات. ئەرزشی بۆ یاساکانی قوتابخانە و بەڕێوبەر دانەناوە. ئازاری هاوڕێکانی داوە...



وەك بلێیـت ئەمانـە بـەس نـەبن، گاڵتـە و گەپیشـی بـە هـاوڕێ خەباتکارەکانی کردووە و وتویەتی: کـارت و مـارت هـەمووی فشـەیە. خۆتـان فریـو دەدەن. کـەس پاداشـتی ئـەم هـەموو هەوڵدانـەتان ناداتەوە.

ئەگەر مامۆستا بڵێت: "بەڵام وەك دەبینن ئەوا ئێستا ساڵ تـەواو بووە، مـن چ کارتێك دەدەم بـە قوتابییـە زیـرەك و کۆششـکەرەکان، هەمان کارتیش دەدەم بە تەمەڵ و کەمتەرخەمەکان"، ئـەوکات تـۆ چ دەڵێیت؟



گەر یەکێك بیت لە تەمەڵەکان پێت خۆشە و دەڵێیت: "ئاخ گیان ڕزگارم بوو... ئەم بەڕێوبەرە چەند مرۆڤێکی بەدەست و دڵە!

بەڵام لەم بارەدا زیرەك و خەباتکارەکان شیاوی ئەوەن بەزەییمان پێیاندا بێتەوە!

تۆ بڕوانە! هەموومان دەرچووین، ئەوچاتر هاروهاجیم دەکرد، ئەوچاتر گوێم بۆ قسەی مامۆستاکان نەدەگرت. باشتر لە هەموو دەرفەتێکدا خۆم لەوانەکان دەدزییەوە".

وەلــێ گــەر یــەكێك بیــت لــە قوتابیــە زیرەكــەكانی پــۆل، واقــت وڕدەمێنــێ و لــە سەرســوڕماویدا دەمــت دادەچــەقێنی، ئەمــە وێــڕای دڵگرانی و خەمگینییەكی زۆر، گریانت دێت و نارەزایی دەردەبڕی.

"ئەمــە چــۆن ئیشــێكە؟! كەوایــە مــن هەڵــەم كــردووە؟ ســاڵێكی ڕەبەق وانەم خوێنــد و هەوڵمــدا، خۆزگــە هــەر نەمخوێندایــە! كاشــكێ منــیش ئەرزشــم بــۆ یاســاكانی قوتابخانــە دانــەدەنا و گوێڕایــەڵی مامۆستاكان نەدەبووم... ئەمە چ نادادپەروەرییەكە، چ ناحەقییەكە!

ئەم دونیایەش وەك قوتابخانە وایە. كەسانێك گوێڕایەڵی فــەرمانی خوای خۆیــان دەكــەن و شــوێن پێغەمبــەرانی ڕەوانــەكراوی زاتــی ئــەو دەكــەون. پەرســتش دەكــەن و هــەوڵ دەدەن خۆیــان لــە هــەموو خراپەكارییەك بەدووربگرن.

مافی كەس پێشێل ناكەن و ئازاری ئەوانی دیكە نادەن، بە ئاگا و باوەڕدارن بە لێپرسینەوەی دواڕۆژ.

كەسانێكیش هــەن دەڵــێن: "ئێــوە خۆتــان فریــو دەدەن، ئێــرە خاوەنێكی نییە. لە خۆڕا پەرستش مەكەن. لە خۆڕا ئومێد مەدەن بــە خۆتــان و دڵتــان خــۆش مەكــەن. كــەس دیــاری و پاداشــتتان نــاداتێ. دواڕۆژ نییــە. بەهەشــت نییــە. پاداشــت نییــە. ئەمانــە هــەموو شــتی پڕوپووچن".

بەڵام كاتێك ڕۆژە مەزنەكــە داهــات، هــەرگیز بــاوەڕدار و بێبــاوەڕ وەك یەك نابن.

لەکاتێکـــدا بەهەشـــت وەك پاداشـــت پێشکەشـــی بەنـــدە سەرڕاستەکانی دەکرێت. سزای چەوتگیرەکانیش دەدرێت.

خودا هەرگیز ئەوان ناخاتە ئەو بەهەشتەی کە باوەڕیان بە بوونی نـــەبووە. هـــەرگیز حـــەزرەتی ئەبوبـــەکر و ئەبوجـــەهلی بێبـــاوەڕ، ڕووبەڕووی هەمان چارەنووس نابنەوە.

باوەڕداران و ئەو بێباوەڕانەی بانگەشەیان دەکرد: "خـودا بـوونی نییە، پێغەمبەران درۆزنن، پەرتووکـەکانیش سـاختە و هەڵبەسـتراون" هەرگیز وەك یەك تەماشا ناکرێن.

خودا بۆ هەمیشە ستەمکار و ستەمدیدە، درۆزن و ڕاسـتگۆ، مـاف زەوتکـەر و مـاف خـوراو، ئـەو دەسـەڵاتدارانەی لەبـەر بەرژەوەنـدی خۆیـان تەنانـەت منـداڵانیش بۆمبـاران دەکـەن و منـداڵانی بێتـاوان، زۆرداران و مافدۆستان، لێك جودا دەکاتەوە.

چونکە خودا دادپەروەرە و نادادپـەروەری لەگـەڵ هـیچ کەسـێکدا ناکات.

بۆ باوەڕداران بەهەشت و بۆ بێباوەڕان دۆزەخی هەیە.

وەك چۆن بەهەشـت شـوێنی پاداشـت و وەرگرتنـی حەقدەسـتە، هەرواش دۆزەخ شوێنی سزا و تۆڵەسەندنەوەیە.

بێگومان دۆزەخ شوێنێکی یەکجار دژوارە.

( بـۆ هـەموو ئەوانـەیش کـە کـافر بـوون و ئینکـاری خـوای خۆیانیـان کـردووە سـزای دۆزەخ هەیـەو، سـزای دۆزەخـیش سـەرەنجامێکی زۆر خراپـە. کـە فـڕێ ئەدرێنـە نـاو دۆزەخـەوە دەنگێکی ناهەمواری وەك دەنگی زەڕەی کەری لێوە ئەبیسن و وەك مەنجەڵ پێیانەوە ئەکوڵێ. ئەو ئاگری دۆزەخە وەختە لە ڕقانا لەو کافرانەی تێی فڕێ ئەدرێن، پارچە پارچە ببێ. هەرچەند تیپێ لەو کافرانـەی تـێ فڕێئـەدرێ دەرگاوانـەکانی لێیـان ئەپرسـن: ئـەوە پێغەمبـەرێکتان نەهاتـە لا لـەم ڕۆژەتـان بترسێنێ؟ ئـەوانیش ئـەڵێن: بەڵێ وەڵڵا. بەڕاستی پێغەمبەرمان هاتەسەرو لەم ڕۆژەی ترساندین، بـەڵام ئێمـە باوەڕمـان پێنـەکردو بـە درۆزنمـان دانـاو وتمـان: حاشـا خوا هیچ ئایەتێکی نەناردووەتە خوار. ئێوە، ئـەی ئەوانەی خۆتـان بە فروستادەی خوا دائەنێن، لە گومڕاهییەکی گەورەدان. ئەیشڵێن: ئەگـەر ئێمـە گوێچکەمان ببوایـە بـۆ بیسـتنی قسـەی پێغەمبـەران یـا هۆش و فاممان بوایە بیرمـان بکردایەتـەوە، ئێسـتا لـە ئـەهلی دۆزەخ نەئەبووین.) الملك: ٦-١٠.

دەپاڕێینەوە و دەڵێین:

خودایە نەمانگێڕی لەو بەندانەی کە شیاوی دۆزەخن!

بمانگێڕی لەو بەندانەت کە فەرموویان لێ دەکەیت بۆ بەهەشتی بەرینی خۆت!

ڕێگای ڕاستمان نیشان بدە و توانا و پێداویستیمان پێ ببەخشە بۆ ئامادەکاری ئەو ڕێگایە!

بوار مەدە بە هیچ کەسێك لە ڕێگای ڕاست لامان بدات!

ئامین!







